**سەرپەرشتیاری گشتی**
**ڕەووف بێگەرد**

**بەڕێوەبەری نووسین**
**کامەران سوبحان**

**دەرهێنەری هونەری**
**ئومێد محەمەد**

**دیزاینی بەرگ**
**ئارام عەلی**

**تایپێست**
**ئارام مەحمود**

**هەڵەچنی**
**سەلام مستەفا**

**ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە**
**هەر ژمارەی**
**تایبەتە بەداهێنەرێك**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**دوو مانگ جارێك دەریدەکات**

**ناونیشان**
**سلێمانی- شارێی سالم**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**ژمارەی تەلەفۆن**
**3120890**

Web Site
www.serdam.org

**پەیوەندیکردن بە ڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی**
Rovar.rovar@yahoo.com

**چاپخانەی**
**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

**بەشێك لەمۆتیفی ئەم ژمارەیە (شاهۆ عەبدولڕەحمان)**

**ژمارەکانی ڕابردووی** ڕۆڤار

**ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی،حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، ملا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادر، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزا، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل.**

# پێڕست

# مەلای گەورە

ئەم ژمارە نوێیەی ڕۆڤار کە تایبەتە بە مەلا محەممەدی جەلی زادەی کۆیە، کە ناسراوە بە مەلای گەورە.
هەرچەندە دوای زیاتر لە ٧٠ ژمارەیە. ئێمە پێمان وایە دەبوو زووتر ڕۆڤارێك تایبەت بکەین بەم مرۆڤە مەزن و خوێندەوارەی کورد، چونکە بەرهەم و توانا و لێهاتوویی و هزری پێشکەوتنخوازی ئەو ڕووناکبیرە گەورەیەمان بووە کە کێشەی نەتەوەکەی و داب و نەرێتی دواکەوتوویی بە تەواوکەری یەکتر داناوەو شەڕی داگیرکەرانی لە هەردوو جەمسەرەکەیدا کردووە، بۆیە ئەوە دێنێت بە ڕۆڤارێك بەسەری بکەینەوە، کە هێشتا درەنگ نییە و ڕەنگە هەوڵەکەشمان هەنگاوێك بێت بە ئاڕاستەی یادکردنەوەی مونەوەرێکی گەورەی نەتەوەی کورد کە نەوەی نوێ وەك پێویست شارەزای بەرهەم و شاکارەکانی نین.
لەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا کۆمەڵێك نووسەر و پسپۆڕی تایبەت لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ئەدەب و رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئاینی و نیشتمانپەروەری مەلای گەورە هەڵوێستەیان کردووە، ئەمە جگە لە بەشێك لە شیعرەکانی ئەم مامۆستا گەورەیەمان لە کۆتایی ڕۆڤارەکەدا بڵاوکردووەتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت ئەم ڕۆشنبیرەی کورد لەو قۆناغەدا بە چ ئاست و تەکنیکێکی بەرزی زمانەوانی شیعری نووسیووە و تائێستاش هەندێ لە شیعرەکانی لە ئاستی شیعری شاعیرانی گەورەی کورددان.
ئەم پیاوە خوێندەوارەی کورد، لە ڕۆژگاری خۆیدا پێش زانا ئاینییەکانی تری کورد کەوتووە، بە تایبەتیش بە فتوا و پێداگریی لەسەر زانست و خوێندەواری و دوورکەوتنەوە لە خورافات، ئەمەش لە چەندین نووسن و شیعرو تەفسیرەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە و بۆ ئەو سەردەمەش یەکێك بوو لە ڕووناکبیرە هۆشیارەکانی نەتەوەکەمان.
ئەم ڕۆشنبیرە کوردە لەو سەردەمە تاریك و پڕ لە کێشانەی نەتەوەکەماندا کاری بۆ ڕۆشنبیریی و کولتووری تازەگەری کورد کردووە و هەندێ لە هەڵوێست و بۆچوونەکانی لە بارەی پرسی ژن و ئازادی و خوێندەواری جێگەی پێزانینێکی زۆرە، نموونە دیارەکەی کاتێك لە ساڵی ١٩١٢ لە سەروبەندی جەنگی جیهانی یەکەمدا دۆستایەتییەك لە نێوان مەلای گەورە و سلێمان نەزیف دیاربەکری والی موسڵ دروست دەبێت، جارێك والی موسڵ داوا لە مەلای گەورە دەکات لیستێك پێداویستی و داخوازی پێشکەش بکات بۆ جێبەجێکردنی، ئەویش جگە لە داوای کردنەوەی قوتابخانەیەك لە کۆیە هیچی تری داوا نەکرد، دوای جێبەجێکردنی داواکەی و کردنەوەی قوتابخانە، مەلای گەورە یەکەم کەس بوو بۆ هاندانی خوێندن کچەکەی لەگەڵ کوڕاندا ناردە بەرخوێندن، ئەمە لەو سەردەمەی کۆمەڵگەی کوردیدا هەنگاوێکی بوێرانە بوو.
ئێستا کە ئەم ژمارە نوێیەی ڕۆڤار بۆ مەلای گەورە دەردەکەین، ٥٩ ساڵ تێ دەپەڕێت بەسەر کۆچی دوایی ئەو زانا و نووسەرە خوێندەوارەی میللەتەکەماندا، کە مەگەر بە تەنها حاجی قادری کۆیی بتوانێت گوزارشت لە خۆی و بنەماڵەکەی بکات، کاتێك بە دێڕە شیعرێك لە وەسفی مەلای گەورەدا دەڵێت:
بە غەیری جەددی ئێوە کێیە دانا
لە کوردستان ئەساسی عیلمی دانا

ڕۆڤار

# مەلای گەورە کێیە و کەی کۆچی دوایی کردووە؟

ناوی محەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا ئەسعەدە، دایکی ناوی (عائشە)یە، کچی حاجی بەکر ئاغای حەویزی یە. لە بنەماڵەیەکی زانیاری و زانستیە، کە بە درێژایی سێ سەد ساڵ خەریکی بڵاوکردنەوەی خوێندەوارین لە کوردستاندا. شاعیری نیشتمانپەروەری کورد (حاجی قادری کۆیی) لە پارچە شیعرێکدا کە لە ئەستەنبوڵەوە بۆ دۆستی خۆشەویست و هاوڕێی خوێندنی (حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە)ی ناردووە دەڵێ:

**بە غەیری جەدی ئێوە کێیە دانا**
**لە کوردستان ئەساسی عیلمی دانا**

ئەم بنەماڵەیە لە بنەڕەتا دەچنەوە سەر (شێخ ئیبراهیم)ی جەزیری، پاشان دێنە گوندی (بێ گەلاس) لە ناوچەی پشدەر، لەوێوە هەندێکیان هاتوونە دێی شیواشان، باپیرە هەرە گەورەیان کە بە مەلا زادەی شیواشان بەناوبانگە، یازدە کوڕی هەبووە، کوڕی هەرە گەورەی (مەلا عەبدوڵلا) بووە، دەچێتە گوندی (جەلی)، لەو ساوە ئەو بنەماڵەیە بە جەلی زادە ناودەبرێن، ئیتر بەم چەشنە بڵاودەبنەوە تاکو لە سەردەمی (مەلا عەبدولڕەحمن)ی باپیرە گەورەیاندا کۆیە دەکەنە مەڵبەند و لێی جێگیر دەبن، مەلا محەمەد لە ساڵی (١٢٩٣)ی کۆچی ڕێکەوتی (١٨٧٦)ی زاینی، لە شاری کۆیە هاتۆتە دونیاوە، لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دەبێ، دایکی کۆچی دوایی دەکات، هەر لە منداڵییەوە بلیمەتیی و زیرەکیی پێوە دیار بووە، بۆیە باوکی زۆر خۆشی ویستووە، زیاتر ئاگاداری و سەرپەرشتی پەروەردە و پێگەیاندن و خوێندنی کردووە، لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە دەستی کردووە بە خوێندن، دەوری فەقێیەتی زوو بەسەر بردووە، لە چواردە ساڵیدا لای باوکی دەخوێنێ، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ئیجازەی زانستی لێ وەردەگرێ، ئیتر لەوە بە دواوە زۆربەی ئیش و کاری مەلایەتی لە جیاتی باوکی بەجێ دێنێ، توانا و زیرەکیی وابوو کە بتوانێ ئیجازەی زانستی بدا بە هەندێ لە هاوڕێکانی خۆی، بەر لەوەی تەمەنی بگاتە نۆزدە ساڵان.

کە باوکی ساڵی (١٣٢٦ك) (١٩٠٨ز) کۆچی دوایی دەکات، نازناوی سەرۆکی زانایان (رئیس العلماء) وەردەگرێ، ئیتر لەوە بەدواوە بە (مەلای گەورە) لە هەموو کوردستاندا ناوبراوە، لە جێگای باوکی دەستی کردووە بە دەرس گوتنەوە، سبەینان تاکو نیوەڕۆ لە مزگەوتی گەورە، پاش نیوەڕۆش لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی باپیری دەرسی وتۆتەوە، لە هەموو لایەکی کوردەواریدا خوێندکاری ئاینیی ڕوویان لە شاری کۆیە کردووە، دەرسیان لە لای ئەو خوێندووە.

گەلێ مەلای ناودار و زانای پایەبەرز لەبەر دەستیدا پێگەیشتن و ئیجازەیان لێ وەرگرتووە لەوانە: مەلا فەتحوڵلای هەرتەل، مەلا سدیق نازەنینی، پاشان بووە بە ڕەئیسی مەحکەمە، مەلا مەعسوم خدر هەورامی — مەلا ئەبوبەکر، مەلا سادقی مەلا ئەحمەد، مەلا سلێمانی ئاوماڵی، مەلا قادری کانی دەربەندی و مەلا حەمید عەسکەری و، ئەوانە و گەلێکی دی لە مەلایانی ناودار کە ژمارەیان لە پەنجا تێپەڕ دەکات.

دوای نەخۆشییەکی کوشندە کە ماوەی چەند مانگێکی خایەند، ئەم مەلا منەوەرەی کورد ڕۆژی ١٩٤٣/١٠/١٢ و لە تەمەنی ٦٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، هەواڵی کۆچی دوایی مەلای گەورەش وەك برووسکەیەك بە هەموو لایەکی کوردستاندا بڵاوبویەوە و دەیان شاعیری گەورەی وەك پیرەمێرد و دڵزار و محەمەد تۆفیق وەردی بە نووسینی شیعر گوزارشتیان لەو خەمە گەورە کردووە، دواجار لە مەراسیمێکی کەم وێنە و گەورەدا لە گۆڕستانی دەرویش خدر لە شاری کۆیە تەرمی مەلای کۆیە بەخاك سپێررا.

**ڕۆڤار**

# میتۆدی مەلای گەورە لەمەڕ (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی)

د. ڕەووف عوسمان

کاتێك برای ئازیز کاك کامەران سوبحان پێی ڕاگەیاندم، کە ڕۆڤار لەسەر مەلا محەمەدی کۆیە دەردەکەن و دەخوازن کە بەندە هاوبەشی لەو ڕۆڤارەدا بکات، بێ سێ و دوو ڕەزامەندیم پیشانداو هەر لەوێدا بڕیارم دا کە لەسەر مەنهەجی (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی) شتێك بنووسم.

ئەم تەفسیرە نەوازەیە دە بەرگەو لە دە ساڵی ڕەبەقدا تەواو بووە، ئەم زانا گەورە و بلیمەتە، هێند زانیاری لە بوارەکانی زانستی قورئاندا هەیە کە سنووری بەزاندووەو بۆتە دەریایەکی بێ پەی، دەتوانین بێ دوودڵیی بە یەکێك لە مەوسوعیەکانی کوردی ئەژمار بکەین و تەفسیرەکەیشی بخەینە ریزی هەرە پێشەوەی تەفسیر نووسەکانی کورد، دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئەگەر مەلای گەورە ئەم تەفسیرەی بە عەرەبی بنووسیایەتەوە، نەك هیچی کەم نەدەبوو لە تەفسیرەکانی زەمەخشەری و بیضاوی و ڕازی، بەڵکو لەبواری ڕای تایبەت و پشت بەخۆبەستن و پەی بردن بە هەندێك نوکتەی جوانناسی و واتای نوێ و گونجاو، دەچووە پێش ئەوانیشەوە.

جەنابی مەلای گەورە لە باسی دانانی ئەم تەفسیرەدا دەفەرموێت: (گەلێ جار بە دڵم دا دەهات کە تەفسیرێ بە زوبانی کوردی دانێم، تا خوێندەوارانی کورد لە کەلامی خۆیان تێبگەن و بەرێ نیشاندانی قورئان، ڕێ بۆ مەنزڵی نەجات ببەن... ئەمما بێ هێزیی خۆم و بێ مەیلیی قەومی کورد، منیان لەوکارە خێرە ڕاگیر کرد. تا لەو ڕۆژانەدا دەستەیێ لە جوانان و لاوانی کورد، کە هەریەك بۆ دەستیارو یاوەری ئەنگوستی بۆ (اشتیاق) و ئارەزووی خۆیان نواند، کە تەفسیرێ بە کوردی لەسەریەك دانێم... زۆر پێ کەیف خۆش بووم... منیش کە (جەلی زادە) کاکە حەمەم پێ ئەڵێن، دەستم پێکرد، بە تەفسیری قورئانی حەکیم و ناوم لێنا (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی)(١).

جۆرەکانی تەفسیری قورئان فرەن و ڕێبازەکانیان جیاوازن و پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە بیرو بۆچون و ئاست و ئایدۆلۆژیای خاوەنەکانیانەوە هەیە و ئاوێنەی هزرو وێناو دنیا بینی ئەوانە، هەر بۆ نموونە

١- (التفسیر المآثور) بۆ ڕاڤەکردنی قورئان، پەنا دەباتە بەر قورئان و سونەت، واتە هەندێك ئایەت بە ئایەتی تر ڕاڤە دەکات، یان هەندێکجار پشت بە بیرو بۆچوونەکانی یاوەران و تابعینەکانی پەیامبەر دەبەستێت. یان هەندێجار ئایەتی قورئان بە فەرمایشتەکانی پەیامبەر ڕاڤە دەکات، ئەوانەی لەم مەیدانەدا تەفسیریان داناوە (الزمخشری، الرازی، القرطبی، الآلوسی، القاسمی).

٢- التفسیر بالرآي: ئەوانەی لەم جۆرەدا کاریان کردووە، بیضاوی، الرازی، النسفی.

٣- تەفسیری شیکردنەوە: تەبەری و قورطوبی لەم بوارەدا قەڵەمیان تاوداوە.

٤- التفسیر الفقهي: شافعي و الجصاص و الکیاهرسی، لەم جۆرەدا کاریان کردووە، واتە لەنێوان ڕاڤەی ئایەتەکانەوە ئەحکامی شەرعیان دەرهێناوە.

٥- التفسیر البلاغي: آبی السعود، الزمخشری، البیضاوی، لەسەر ئەم بنەمایە ڕاڤەی قورئانیان کردووە، واتە دەستنیشانی توخمی زانستە بەلاغیەکانیان کردووە، وەك ئیستعارەو کنایە و تشبیة و... هتد

٦- التفسیر الصوفي: ابن عربی، الالوسی، ابی عبدالرحمان السلمی لەم جۆرە تەفسیرەدا قەڵەمیان خستۆتە گەڕ.

لەڕاڤەی ئایەتی (وماآسآلکم علیه من آجر ان آجری علی رب العالمین) پەڕیوەتەوە بۆ ڕیسواکردنی خورافات و ئەفەرۆز کردنی هەوڵەکانی شێخ بۆ هەڵفریواندنی خەڵکە عەوام و نەخوێندەوارەکە و نموونەیەکی شیعری حاجی قادری کۆیی هێناوەتەوە:

٧- التفسیر الفلسفي: الفارابی واخوان الصفا، لەم بوارەدا هەوڵی بەرچاویان هەیە، دیارە گەشەسەندنی فەلسەفە دوای وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفیەکان بۆ زمانی عەرەبیە دەستی پێکردووە.

٨- التفسیر الموضوعي: الراغب الاصفهاني، ابن القیم ابی جعفر النحاس، الرازی، لەم بوارەدا کاریان کردووە.

٩- التفسیر الآدبی والاجتماعي: المراغي، رشید رضا، محمد عبده، هەوڵی بەرچاویان هەیە.

ئەوەی تێبینی دەکرێت کە هەندێك ناو لە بوارە جیاوازەکانی تەفسیردا دووبارە و سێ بارە دەبنەوە، واتە ئەمانە لە زیاتر لە بوارێکدا هەوڵی بەرچاویان هەیە، چونکە زۆربەی ئەم موفەسیرانە زانای بوارەکانی قورئانن و سەریان لێی دەردەچێت.

با بزانین مەلای گەورە، لەکام لەم بوارانەدا ئەسپی خۆی تاوداوە و کامە جۆری تەفسیری بۆ ئێمە چێ کردووە، وەك خۆی دەفەرموێت موتالای ئەم تەفسیرانەی کرووە، (زمخشری، طنطاوی، آلوسی، سید رشید رضا، حەسەنی نیسابوری، ابو سعود، الطبری). ئەبێت ئەوەشمان لەبەچاو بێت کە مەلای گەورە، ڕای تایبەتی خۆی بەرامبەر بە هەریەك لەمانە هەیە و مەرج نییە هەمووشیانی بە دڵ

بێت، زۆرجار شتی بۆ ڕاست کردونەتەوە، دیارە ئەوەی کە بەباش و ڕاست و ڕەوانی زانیوە لێی وەرگرتوون و سوودی لێ بینیون، نابێت لەوە ئاگادار نەبین کە موفەسیرەکان، هەر هەموویان سوودیان لەیەك بینیوە، هەندێکیان شتی نوێیان خستۆتە سەر دیواری تەفسیرەوە، بەڵام گرنگ یەکەم موفەسیرە، کە وێراویەتی دەست بۆ ئەم بابەتە گرنگە بەرێت و پشت بە خۆی ببەستێت، هەرچەندە لە کۆنەوە وتراوە (المجد للآولین والسبق للاخرین)، نابێت ئەم پەندە ئیرلەندییەش لە بواری بەراوردکارییا فەرامۆش کەین، کە دەڵێت (جەستەی شێر بریتیە لە کۆمەڵێك بەرخ)، واتە هیچ شتێك بێ پەیوەندی نییە بەشتەکانی ترەوە! واتە هەموو شتەکان بەیەکەوە پەیوەندارن و ئاگایان لەیەکە.
لەم نووسینەدا هەوڵئەدەم بە کورتی مەنهەج و پرۆگرامی مەلا محەمەدی کۆیە لەمەڕ (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی) پیشان بدەم و لەڕووی ئەکادیمییەوە ئاستی پێشەوە چوونەکانی بە بەراورد لەگەڵ موفەسیرەکانی تر دەستنیشان بکەم.
١- لەبەرئەوەی کە زمانی کوردی خزمەتی زۆرکەم کراوە و نەبۆتە زمانی دەسەڵاتی سیاسی و ئیداری و زانستی و لە چوارچێوەیەکی دیاری کراودا چەقی بەستووە، دەستەواژە و موفرەداتی لە بواری زانستدا ئێستاشی لەگەڵ بێت، کەمە، دەسەڵاتی بابان و ئەردەڵان و سۆران، هێند تەمەن درێژ و کەم کێشە نەبوون، هەتا لەم بوارەدا کاری جدی بکەن، دیارە گەشەسەندنی زمانیش پرۆسەیەکی درێژخایەنە و لە مەودایەکی دووردا ڕەنگ دەگرێت، مەلای گەورە لەژێر باڵی ئەم دەسکورتییەدا دەناڵێنێ و دەفەرموێت: (زمانی کوردی مقابلی عەرەبی زۆر زەبون و فەقیرە، آغلب لەلا ڕا بۆ مەعنای ئایەت ئەڕۆیشتم، وە بەعبارەتی درێژ ئیفادەی مەرامم دەکرد، هەرچەندم کرد مقابلی (فسیکفیکهم) چم بۆ نەهات)(٣).
دیارە ئەم حاڵەتە وای لێکردووە کە بەناچاری کورداندنی وشە عەرەبییەکان بکات، ئەویش لە ڕووی ڕێزمانییەوە، واتە بە تێکەڵکێشکردنی بە پاشگرو پێشگرو هەندێك دەستەواژەی کوردی، ئەوەی کە ئێستا لە زمانی فارسیدا دەگوزەرێت، لە مەڕ بەکارهێنانی وشەگەلی عەرەبی، هەمان ڕێبازەکەی مەلای گەورەیە، دیارە ئەم ڕێبازە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی بوارەکانی زمان، هەر زمانێك بێت، کاتێك کە فارسەکان دەڵێن (دخانیات ممنوع است)، تەنیا مەبەستیان تێگەیاندنە نەك فەنتازیای ڕازاندنەوەی ڕستە و جوانکاری شێواز. هەر ئەم ڕێباز و بیرکردنەوە دروستەیە، کە وای لێکردوون هەموو زانستەکان وەرگێڕنە سەر زمانی فارسی و لەو ڕێگایەوە بەهرەمەند و دەوڵەمەندی کەن.
لە ڕاڤەکردنی ئایەتی (الله الذی رفع السماوات)دا دەفەرموێت (ممکنە مرادی کواکب بن ئەوانیش وەکی عەردی ئێوە محادنن، ثقیلن)(٤)، ئایەتی (یکفرهم) وا ڕاڤە دەکات (بە سەبەب و کفر و جهلیان بوو، ئەگەر ئەوانە ئاثاری ئایاتی کرامیان ذەررەیێ ئیمان لە قەلبیان دا هەبوایە)(٥). با ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە لەڕۆژنامەی ژیان و پێشکەوتن و تێگەیشتنی ڕاستی و... هتد هەمان شێواز پیادە کراوە لە نووسیندا، بەم حاڵەتەشەوە مەلای گەورە لە ڕێگای ڕاڤەکردنی ئایەتەکانەوە زمان و شێوازی داڕشتن و پەخشانی کوردی دەوڵەمەند کردووە و هەوڵی زۆری داوە کە ئەو زمانە بخاتە سەر ڕێگای وەرگێڕان و ڕاڤە و پێناسە و ڕوونکردنەوەوە، چونکە لە سەردەمی ئەودا هەوڵی پەخشانی کوردی کەم بووە.
ئەوەی کە ئێجگار لەبەرچاوە، مەلای گەورە بە بەچکە دیالێکتی کرمانجی خوارو ڕاڤەی ئایەتەکانی کردووە و بیروڕاکانی بەرچاو خستووە، دیارە ئەم بەچکە دیالێکتە لە هەندێك لایەنی ڕێزمانییەوە بە هێڵێکی هاوتەریبی ئەم شێوە نووسینەی ئێستادا ناڕوات و لە هەندێك شوێندا بەریەك دەکەون و کێشەی ڕێزمانیمان بۆ دروست دەکەن، هەرچەندە ئەم شێوە زارە لە ئێستادا گۆڕانکاری پۆزەتیفی بەسەردا هاتووە.
بەراورد کردنی شێوازی ئەم تەفسیرەی مەلای گەورە لەگەڵ تەفسیرەکانی شێخ محەمەدی خاڵ و شێخ عەزیز پارێزانی و عەبدولکەریمی مودەریس و بورهانی ئەمینی و ئیبراهیم مەردۆخی و وەرگێڕانەکەی هەژار موکریانی، دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامە دڵخۆشکەرەی کە زمانی نووسینی کوردی لە بواری دەوڵەمەند بوونی کەرەستەی زمانەوە، هەنگاوی گورج و درێژی هەڵهێناوە و دەربڕینی سفت و سۆڵی کوردانە لە بواری زانست و هزر و ڕۆژنامەگەری و ئابووری ناسی و ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە بەڵگەی ڕوونی ئەم بەرەو پێشەوە چوونەیە.
دیارە ئەم دەوڵەمەند بوونی زمانی کوردییە، بەری ڕەنج و تەقەللای لەبن نەهاتووی ڕووناکبیرە کوردەکانە بەدرێژایی ئەو مێژووە، بەڵام نابێت ئەوەمان بەسەردا تێپەڕێ کە ئەفسوس! ئێمە لە ١٩٩١وە خۆمان حوکمی

خۆمان دەکەین، بەڵام تا ئێستا نەمان توانیوە زمانێکی کوردی ستانداری یەکگرتوو فەراهەم بێنین، لە ناوچەی بادینان بەو شێوە زارەی ئەوێ واتە (کرمانجی سەروو) خوێندکار وانە وەردەگرێت، لەناوچەی سلێمانیش بە شێوازی کرمانجی خواروو، ئەم دیاردە ناتەواویی و خەمساردییە، بۆتە برینێکی قووڵ بە جەستەی نەك هەموو کوردێکی دڵسۆزەوە بەتەنیا، بەڵکو بەم قۆناغە هەستیارەی جوڵانەوەی ڕزگاری خوازی کوردیشەوە.

٢- وەك دەزانین قورئانی پیرۆز حەوت جۆر خوێندنەوەی هەیە و تەنانەت لای هەندێکیش بۆتە دە، موفەسیرەکانی قورئان، بە گوێرەی بیر و بۆچوونە جیاوازەکانیان، جۆری خوێندنەوەیان هەڵبژاردووە، هەر بۆ نموونە (مالك یوم الدین) وشەی (مالك) دەشێت بگۆڕێت بە (ملك) وەك کرداری ڕابردوو، خۆ دەشێت بوترێت (ملك)، هەندێك قرائات هەیە هەر دەگمەنە، مامۆستای کۆیی ڕەفزی ئەم جۆرە خوێندنەوەیەی کردووە، ئەوەتانێ دەفەرموێت. (قرائەتی «شاذە»ی «متخالفە»م کەیف پێ نایەت، بۆیە چم نەقڵ نەکردیە، و بۆ قراءات غەیری قراءاتی مەعروف لە وڵاتی خۆمان کەمم تعرض کردیە)(٦)، دیارە مەلای گەورە ئەوەی زانیوە کە گۆڕینی (قراءات)، دەبێتە هۆی گۆڕینی واتاو لەو نێوەندەوە کێشەی مەزهەب گەرایی دێتە گۆڕێ، هەر بۆیە خۆی لەو بەرەوژوورکەیە نەداوە.

٣- ئەوەی کە هەستی پێ دەکرێت مەلای گەورە تا توانییتی خۆی لاداوە لە مەسەلە فیقهی و شەرعیەکان و دەرهاویشتنی (استنباط) مەسەلەکانی فەرامۆشکردووە، چونکە دەرهێنانی ئەو ئەحکامانە قورسن و دەبێت لە شوێنی تردا باس بکرێن، قووڵبوونەوە لەو بوارەدا دەبێتە هۆی لادان لە کارە سەرەکییەکە، با ئەوەش نەبوێرین کە ئەحکامە شەرعییەکان دوای هاتنە خوارەوەی قورئان و پێویستە کۆمەڵایەتییەکان و چڕ بوونەوەی ژیانی کۆمەڵگە سەری دەرهێنا، مامۆستای گەورە خۆیشی دەفەرموێت (بحث م لە استدلالاتی (فقهاء) بۆ استنباط ی احکام شرعیە لە قورئان غایەت کەمە)، دەبێت ئەوەش بزانین کە یەکێك لە هۆکارەکانی فەرامۆشکردنی لایەنی فیقهی، بەربڵاوی بابەتەکەیە و دەبێت دەست بۆ هەر چوار مەزهەبەکە بەرێت و بکەوێتە گێژاوی کێشەی نێوان مەزهەبەکانەوە، دیارە ئەم لایەنەش وابەستەیە، تەنیا بە خودی مەلاکانەوە و ناشکرێت بەشێکی زۆر لە تەفسیرەکە تەرخان کرێت بۆ خەڵکێکی کەم و ئەو بابەتانەش لە کتێبە شەرعییەکاندا زۆرن و مەرجیش نییە هەموو موفەسیرێکی قورئان پسپۆڕ بێت لەبواری شەرع ناسیدا.

٤- دەتوانین جۆری ئەم تەفسیرەی مەلای گەورە بخەینە ژێر دەواری (التفسیر بالرآی المحمود) کە ڕازی و بیضاوی و نسفی پەیڕەویان کردووە.

کەسایەتی ڕاڤەکەر لەم جۆرە تەفسیرانەدا بە جوانی دەدرەوشێتەوە و تیشکی خۆی دەبەخشێت، بەتایبەتی کاتێك کە ڕایەکی جوان و بایەخدار دەخاتە پێشچاوی خوێنەرو هەر ئەم ڕاو بۆچوونە تایبەتانەشە، کە لە ڕاڤەکەرەکانی تری جیادەکاتەوە و لەم بوارەشدا (ترجیحات)ی زۆری هەیەو دیارە خودی توخمی (ترجیح) دەچێتەوە سەر ڕای تایبەت لەمەڕ مەسەلە جیاوازەکان، هەر بۆ نمونە سەبارەت بە ڕاڤەی ئایەتی (انما جعل السبت علی اللذین اختلفوا فیە)، دەفەرموێت (ئەوەی امام و زمخشری ئەیفەرمون، وەسیدی (آلوسی) نقلی کردیە، هیچی ناچێتە دەماغم، شەوو ڕۆژی (مراجعە)ی لغەتم کرد مەعنای (سبت) بە (حیرەت) ثم (موت)، مناسبی ئێرەم دیت، وە ضمیری (فیە) راجعی ابراهیم بێت)(٨)، سەبارەت بە حەدیثی پەیامبەر (د. خ) (اختلاف أمتی رحمة) دەفەرموێت (حاشا اختلافی وا (قط) رەحمەت نیەو عەینی غەزەبە، آساسا ئەمە حدیثی مقبول نیە)(٩) سەبارەت بە ڕاڤەی ئایەتی (ثم ان علینا بیانە). دەفەرموێت (ئەگەر اشکالت بوو، بۆت بەیان ئەکەین، من لە مێژە ئەو مەعنایەم لە (بخاری) و (تفاسیر) ی دی دیوە، بەڵام نەهاتە دڵم، چەندم کردو ئەکەم، دڵم قبوڵی ناکاو ناتوانم لام وانەبن و (توجیە)وە دەلیلی لەسەر بێنم)(١٠).

٥- جەنابی مەلای گەورە گەلێ ئایەتی لە (اسباب النزول) دابڕکردووەو دەقی ئایەتەکەی بە بەهایەکی ڕەهاو هەمیشەیی داناوە، ئەوەتا دەفەرموێت (حاجەت بە ئێمە نیە اظهاری مناسبات بکەین)(١١)، زانای گەورەی کورد موستەفا زەڵمیش لەیەکێ لەنامەی دکتۆراکانیا بەناوی (التبیان لرفع غموض النسخ فی القرآن)، هەمان ڕاو بۆچوونی هەیە، هەر بۆ نموونە سەبارەت بە ئایەتی (لکم دینکم ولی دین) دەفەرموێت (علمای اصول ئەفەرمون ئەم سورەتە (منسوخ الحکم)ە تلاوەتی باقیە، محقق ئەگەر (بلمرة) (منسوخ الحکم) با، لەقوئاندا نەدەنوسرا)(١٢)، هەروەها لە تەفسیری ئایەتی (فآقرء وا ماتیسر من القرآن) دەفەرموێت (جەنابی سیدی آلوسی

کۆنە شافعی، تازە حەنەفی، تفصیلاتی زۆری هەیە.....) (١٣)، ئالوسی لەشوێنێکدا هێرشی سەخت و ناڕەوا دەکاتە سەر کورد، هەرچەندم کرد نەمدۆزییەوە، ئیتر نازانم ئایا جەنابی مەلای گەورە بەرپەرچی داوەتەوە یان نا؟! دەڵێن قسە قسە ڕادەکێشێ و باس باسی (اسباب النزول)ە، جارێك لەبەردەم پەرلەمانی عێراقدا وتارێکم سەبارەت بە مەزلومیەتی شاری کەرکوك خوێندەوە و لەدواجاردا بەم ئایەتە قفڵم کرد (وآخرجوهم من حیث آخرجوکم والفتنة آشد من القتل)، جلال الدین صغیر لێم ڕاپەڕی و وتی تۆ دژ بە خودا و قورئان دەوەستیت، چونکە ئەم ئایەتە لە سیاقی مێژوویی خۆی دەرئەهێنیت، وەڵامەکەم ئەوە بوو کە ئایەتەکانی قورئان نەمرن و کوردیش مەزڵوم و سەدام و عەرەبە هاوردەکانیش زاڵم، لەبەرئەوە چۆن کوردیان دەرکردووە ئاواش گەرەکە دەرکرێنەوە و ئەمەیە عەدالەتی قورئان و خودا، دیارە ئەو لەڕووی شۆڤێنیەتەکەیەوە قایل نەبوو!! دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە مەسەلەی عەدالەتی ئیجتماعی و مرۆڤدۆستی و نەهێشتنی زوڵم و زۆر مەرجە بنەڕەتیەکانی ئیسلامن.

٦- مەلای گەورە نەترساوە لە دەرهێنانی واتای نوێ، واتایەك کە یارمەتی کۆمەڵگا بدات بۆ بەرەو پێشەوە چۆن و ڕزگاربوون لە چەوسانەوەی فرە لایەن و نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکان، هەر بۆیە لە گەلێ شوێندا هێرشی سەختی کردۆتە سەر سۆفی و مەلا و دەروێشەکانی سەردەمی خۆی و داوای لە مەلاکان کردووە، کە بۆ ڕاڤەی هەندێك ئایەتی قورئان پشت بە عەقڵی خۆیان ببەستن و ڕاڤەیەك دەستنیشان کەن کە بەختیاری ئادەمیزاد دەستەبەرکات، ئەوەتانێ دەڵێت (متصوفە هەن خوایان ئەوێ بە آمر بەر، ئەگەر شەخسێ خلافی مەشرەبیان شتێ بکات، هجومی ئەکەنە سەرو لە دین و ئیمان دەچێتە دەر، ئەو نەوعە (العیاذ باللة حقیقة مؤمن نین)(١٤)، لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: (مەلاو صۆفیان شەڕیانە لەسەر مام خدری! آما ئێستا ناوی گوم بووە، لەوەتی ڕێی بری و بحری تآمین کرایە سهلبوە) (١٥) دیارە مەبەست لە مام (خدر) خدری زیندەیە، کە تائێستا هەن دەڵێن ماوەو مەلای گەورەش گاڵتەی پێ دێت و دەڵێت خەرافاتە.

**لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت:**
**مەلای نادان بە عنوانی شریعەت**
**حەرامی کرد لە تۆ عیلمی طبیعەت(١٦)**

ئەم ڕەخنە بابەتییە ئازایانەیە، مەلای کۆیە دەکاتە ڕابەرێکی وشیارکەرەوەی سەردەمەکەی خۆی و بە نەمریی لە دڵە گەورەکەی ژیاندا ئەیهێڵێتەوە.

**کە وەی گوت شێخی من دەستەگێڕم لەلام وابوو**
**لەبەر جاهل و جەوانی، کە پیر بووم تێ گەیشتم دەستی گرتم**
**لە کارو کەسب و تحصیلی مەعانی، بەڵێ شێخ قوطبە**
**آما قوطبی ئاشە، بە ئاوو نیعمەتی خەڵقە گەڕانی**

هوشیار نەبوونەوەی میللەتی کوردو بڕاوبوونی بە خورافات، مەلای گەورەی تووشی ئازاری دەرونی و ڕەشبینی کردووە، ئەوەتانێ دەڵێت:

**من یەخەی خۆم لەبۆیە دادەڕم**
**ئێوە نابن بەهیچ و من دەمرم**

مەلای گەورە هەمیشە لادانەکانی (استطراد) لەڕاڤەی ئایەتەکاندا بەستۆتەوە بە ڕزگاری کوردو داهاتوویەکی گەش بۆ نەوەکانی داهاتوو، دیارە ئەم ئەرکە نەتەوەیی و شارستانیەشی بەستۆتەوە بە بنەماکانی ئاین و قورئانی پیرۆزەوە، واتە لەیەك کاتدا ئەرکی ئاینی و نیشتمانی بەجێهێناوە، تێکەڵ کردنی ئەم دوو ئەرکە بەئاڕاستەیەکە، کە مرۆڤ تووشی دابڕان ناکات و هەست بە خواستی یەکپارچەیی ئایەتەکە دەکات و تێکۆشان بۆ ڕزگاری کورد، بە بەشێك لە ئەرکی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دائەنێت.

٧- جەنابی مەلای گەورە، زانایەکی ئێجگار پایە بڵندەو لە زانینی هەموو بابەتە عەقڵی و نەقڵییە ئاینییەکاندا کەم وێنە بووە، هەر ئەو هۆیەشە وای لێکردووە کە لە هەموو بوارەکاندا پەل بهاوێ، زۆرجار لە بابەت لائەداو (استطراد) سەردەکات بە گەلێ کون و کەلەبەری ژیاندا و تاقیکردنەوەی ڕەسەنمان بۆ چێ دەکات، جار هەیە سەردەکات بە قووڵایی دەریای مێژووی مرۆڤایەتیداو گەوهەر و زمروتی سەر بوردەکانی ژیانمان بۆ دەردێنێ، چاومان دەکاتەوە و غیرەت دەخاتە بەردەممان.

بە بۆچوونی من ئەم لادانە (استطراد) زۆرانەی مەلای گەورە لە چەند هۆکارێکەوە سەرچاوە دەگرێت:

١- زانیاری فرە مەودای مەلای گەورە لە ئاستێکدایە کە وێنا ناکرێت، مرۆڤێك لە بوارەکانی؛ شرع، شیعر، عقائد، کلام - فلسفة، آصول، مذاهب، تصوف، زمان، بلاغة، نحو، صرف، مێژوو، قووڵایی کۆمەڵایەتی.... زانیاریەکانی سەردەم... هتد، ئەو هەموو شتە بزانێ و

لێی بڕژێت، دیارە پرژەكانی دەبنە ئەو (استطراد)ە سوود بەخشانە و مێشكمان گەش و ئاوەدان دەكەنەوە.

٢- یارمەتیدانی خوێنەر بۆ ئەوەی وەڕس نەبێت و پاشەكشە نەكات لە خوێندنەوەی تەفسیرەكەی، دەرخستنی ئەم هەموو بابەتە جۆر بەجۆرە، دەرگای ئاسودەیی دەروونی بۆ خوێنەر دەكاتەوە.

٣- لە ڕێگای ئەو لادانانەوە وانەی ژیانمان بۆ چێ دەكات، بیرمان ڕووناك دەكاتەوە و مەبەستە پیرۆزەكانی والا دەكات و گەرەكیەتی لەو سۆنگەیەوە هۆشیاری كۆمەلایەتی و سیاسی و ئاینییمان پێ بلێتەوە، گیانی كوردایەتیمان بەهێزكات، ئاسۆی داهاتوومان بۆ ڕوونا‌كتركاتەوە.

ئەگەر موفەسیرە عەرەبەكان جاروبار پەنایان بردبێتە بەر شیعرێك بۆ دەرخستنی بابەتێكی زمانەوانی یان بەلاغی، ئەوا مەلای گەورە، شیعری كوردی و عەرەبی و فارسی پڕ بایەخی بۆ هێناوین، دیارە لە نموونە شیعریەكاندا، پەنای بۆ شاعیرە گەورەكانی خۆرهەلات هێناوە، بەلێ ئەو چێژی شیعری بە خیام- حاجی قادری كۆیی- نالی- حافظ- شێخ ڕەزا و سعدی و ابو العلای معری و موتەنەبی و جەلالەدینی ڕۆمی پژاوە. لە ڕاڤەی ئایەتی (والصبح اذا تنفس)دا ئەم شیعرەی نالی بیركەوتۆتەوە:

**هەناسەم زولفەكەی لاداو مەیلێكی نەكرد چاوی(١٧)**
**(نسیم) ئەنگوت و شەو ڕابوردو نەرگسی هەر لەخەودایە**

دیارە ئەم شیعرەی نالی ملوانكەیەكی مرواریيەو لوتكەی داهێنانی خۆرهەلاتە.

لە ڕاڤەی ئایەتی (لكم دینكم ولی دین)دا ئەم شیعرەی خیام ی بیركەوتۆتەوە:

**یەك دەست بە (مصحف) و یەك دست بەجام(١٨)**
**گەهێ سوویی (حلال) و گەهێ موویی حرام**

ئەم بەیتەی خەیام ئاوێنەیەكی بەرهەتاوی دەروونی مرۆڤە.

لەڕاڤەی ئایەتی (قل ان الموت الذی تفرون منه ملاقیكم)

ئەم شیعرەی كردۆتە دەستە گوڵ

**ومن لم یمت بالسیف مات بغیره(١٩)**
**تعددت الاسباب والموت واحد**

لە ڕاڤەی ئایەتی (فآی الفریقین آحق بالآمن)

چوارینەیەكی حاجی قادری كۆیی بیركەوتۆتەوە:

**آمین بە لە سبەینێ كە چت بەسەردێنێ(٢٠)**
**حوادثاتی زەمانە كە نایەتە تخمینی**
**ئەم آرضە كۆنە هەوارە خەلایقیشی كۆچە**
**امیدی سودی نەبێ كەسی لەژێر چادری شینی**

ئەم چوارینەیە پەندێكی بێ وێنەیە بۆ ئەوانەی كە هەموو شت دەكەن لە پێناو دنیایەكی خەرابات ئاسادا. لە ڕاڤەی ئایەتی (لایستوی آصحاب النار و آصحاب الجنة اصحاب الجنة هم الفائزون) ئەم شیعرەی ئەبولعەلای معری بەشایەت هێناوە:

**واذا تساوت فی القبیح فعالنا(٢١)**
**فمن التقی وآین الفجار**

دیارە لەم بوارەدا ئێجگار نموونەمان هەیەو دەرفەت نییە، حەز دەكەم بۆ یەكەمجار ئەوە بلێم كە مەلای گەورە لە نێوان ئەم بەراوردكارییانەوە بە پێشەوای داهێنانی بواری ئەدەبی بەراوردی كوردی دەناسێنم.

مەلای گەورە ئەم تەفسیرەی بۆ توێژی دەست بژێری (نخبة) ی كورد نووسیوەتەوەو هەموو كەس چێژی لێ نابینێ، دەوركردنەوەی ئەم تەفسیرە گەیاندومیەتە ئەو

المصقول
فی علم الأصول

بڕوایەی کە مەلای گەورە پایەدارترین زانای کوردی سەردەمی خۆی بووە لە هەموو بوارەکانی زانیاری سەردەمەکەیدا، ئەم کەڵە پیاوە خاوەن میهرە، ئاگای لە ڕووداوە جیهانییەکانی سەردەمی خۆی بووە، نەك هەر ئەمەش، لە بوارە زانستییەکاندا ئەسپی تاوداوە، ئاگای لە داروین و غوستاف لوبون و ناپلیۆن و کی و کێ بووە، ئاگای لە بیرو بۆچوونی موعتەزیلە و ئەشعەری و ڕاکانی جەمهوری عولەما بووە، لەو سەری فیقهی سونی و شیعییەوە هاتۆتەوە، ئاگای وردی لە ناسخ و منسوخ و مجمل و مفصل و ئەسبابی نزول بووە، تاك بە تاك کەسایەتی یاوەرانی پەیامبەری ناسیوە، مێژووی پڕ لە گێچەڵی سەردەمی خەلافەتی ئەزبەربووە، هەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی لە ئاستێکی بەرزا زانیوە، ئاگای لە شاعیرە بەرزە خۆرهەڵاتییەکانی عەرەب و فارس بووە، من نازانم چۆن کاتەکان بەشی ئەم هەموو زانیارییەی ئەوی کردووەو چۆن پیاڕاگەیشتووە؟ کەی وانەی بە فەقێکانی وتۆتەوە؟ کەی کەوتۆتە موتالای تایبەتی خۆی؟ کەی وەك خۆی دەڵێت خەریکی کشتوکاڵ و فەلاحەت بووە؟ کەی ئەو هەموو کتێبەی داناوە؟ ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی چۆن چۆنی جێ بەجێ کردووە؟ شەو و ڕۆژ چەند کاژێر خەوتووە؟ بۆ کاتی ئیسراحەتی بۆ ماوەتەوە؟! مەلای گەورە و مەولانا خالیدو شێخ مارفی نۆدێ و بەیتوشی، ئەو لوتکە سەرکەشانەن کە هەتا کوردێ مابێت گەرەکە شانازییان پێوە بکات، ئەم کەڵە زانا دەگمەنانە خاوەنی عەقڵیەتی مەوسوعیی و تا ئێستا هاوتایان نەبینراوە لە کۆمەڵگەی کوردیدا، ئەمانەن سەرمایەی عەقڵ و هوشیاری سەردەمی خۆیان. دەشێت لەسەردەمی ئەمانەدا دەیان خەڵکی خاوەن سامانی قەبەو دیوەخان و یەری یەری هەبووبن، دەشێت چەندان ئاغاو گزیرو سەرۆك هۆزو تایفە هەبووبن، دەشێت لە سەردەمی ئەمانەدا چەندان سیاسەت بازی! پابەستەی ئێران و توران هەبووبن و بەدەم کوتان لە سیاسەت و دنیاداری، خەڵکیان لە خشتە بردبێ! بەڵام کوا ناویان؟ کێ باسیان دەکات؟ ئەرێ کۆشك و سامانەکانیان فریایان کەوتوون؟ کوا پارەکانیان؟ کوا خزمەت کارو خەدم و حەشەمیان، بۆ تەنانەت شۆستەی مێژووش دەیان گریتە خۆی؟ سەیرەکە لەوەدایە ئەم مشەخۆرانە دەرس لە مێژوو وەرناگرن و هەر بەدوای دەسەڵات و ساماندا ڕادەکەن. ئەگەر نالی چامەی (ئەم تاقمە مومتازەی کەوا خاصەیی شاهن)ی بۆ سەربازەکانی ئەحمەد پاشای بابان نەوتایە، هەر زوو ئەحمەد پاشا لەبیر چوو بووەوە، چامەکانی مەولەوی نەبوایە، کێ مەحموودی یارەویس و ئامینەخانی کەیخەسرەو بەگی دەناسی؟ ئەگەر مەولەوی و پیرەمێرد نەبونایە کەس مەحموود پاشای جافی لەبیر نەدەما، ئەبو تەمام نەبوایە خەلیفە موعتەسەم دەمێك بوو کوژا بووەوە، ئەگەر موتەنەبی نەبوایە سیف الدولة ئێستاکە لە کوانوی مێژوودا خۆڵەمێش بوو، کەواتە نەمامی مێژوو، خاوەن بیرو داهێنەرەکان شەتڵی دەکەن نەك ساماندارە سازش کەرەکان.

٨- وەك وتم تەفسیری قورئانی مەلای گەورە نزیکە لە جوری (التفسیر بالرآی المحمود)، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کە لایەنەکانی تری فەرامۆش کردبێت، لە کوێدا پێویستی کردبێت پەنای بردۆتە بەر جۆرەکانی تری تەفسیر بۆ سەقامگیرکردنی کارەکەی، زۆرجار ڕاڤەی ئایەتێکی بە ئایەتێکی تری قورئان یان فەرمایشتێکی یاوەرانی پەیامبەرو تابعینەکانی کردووە، بۆ ڕاڤەی ئایەتی (وجعلت لە مالا ممدودا) دەفەموێت (واسع بە (نما) و (زیادی)، لە ابن عباس و مجاهد و ابن جبیر مەنقولە) (٢٢) بۆ ڕاڤەی ئایەتی (ومایذکرون الا آن یشاءاللە) سوود لە ئایەتی (آمنت بما آمنت بە بنواسرائیل) دەبینێت(٢٣)، زۆرجار هەڵەکانی زمخشری و طبری و سید رشید رضا ڕاستدەکاتەوە، بۆ ڕاڤەی ئایەتی (وما صاحبکم بمجنون) بەم شێوەیە موفەسیرو عالمی گەورە زەمەخشەری لە هەڵە ئاگادار دەکاتەوە (وای (آسف) بۆ (زکای) زمخشری، فەطانەت و درایەتی زمخشری چۆن غافڵ بووە لە مقتضای مەقام.... هتد)(٢٤)، سەبارەت بە طنطاوی دەڵێت (آما تەماشاکردنی طنطاوی بێ فائدە نیە، گەرچی خاڵیە لە قیمەتی تەفسیر)(٢٥)، بۆ ڕاڤەی ئایەتی (ثم ان علینا بیانە) دەفەرموێت (دو مەعنام واردی خاطر بوو لام وابوو محض هی خۆمن، کەس لەمن سەبقەتی نەکردیە، وە زۆر جەسارەتێ گەورەیە من مخالەفەی (ابن عباس) و ئەو هەموو مەلایانی عضیم الشآن بکەم،...) (٢٦)، دیارە ئەم خۆجیاکردنەوەیە، لوتکەی بڕوا بەخۆبوونە، بەڵگەی زانایی و دڵنیابوونە لە تواناکانی.

٩- مەلای گەورە لە تەفسیرەکەیدا، لایەنی نەحوی و بەلاغی فەرامۆشکردووە، خۆ ئەگەر جارە ناجارێك بەر بە قەڵەمەکەی گیرابێت و پێویستی کردبێت، ئەوا ئاوڕێکی ناچاری لێداوەتەوە دیارە ئەوەی لەبەرچاو بووە، کە قووڵ بوونەوە لەم دوو بوارەدا دەبێتە هۆی

لەدەستدانی مەبەستی سەرەکی، کە دەرخستنی واتاکانی
قورئانی پیرۆزە، موفەسیرەکانی وەك زمخشری و بیضاوی
و ابو السعود لەم دوو بوارەدا چارەویی خۆیان تاوداوە،
تەنانەت مەلای گەورە، هانی دەست بژێری کوردیشی
داوە کە هێند خۆیان مەشغول نەکەن بە (نحو، صرف)
ەوە و قووڵ بوونەوە لەم بوارانەدا جۆرێك لەبێ
سەروبەری و زیادەڕەوییە، وە هەمیشە ئەوەی خستۆتە
پێش چاو کە نحو، صرف، بلاغة هۆکارن نەك ئامانج،
بەلام بەداخەوە جار هەبووە وا کەوتۆتەوە لای مەلای
کورد کە بوونەتە ئەنجام و زۆربەی تواناکانیان لەم بوارە
لابەلایەدا سەرف کردووە.

١٠- لەسەرەتای ئایەتەکاندا یەکەمجار واتای فەرهەنگیی
وشەکانی داوەو بەدوای ئەودا، واتای ئایەتەکە بە
تێکڕایی، ئەم ڕێبازە پتر ڕێبازی قوتابخانە و زانکۆکانە،
کە مامۆستاکان پەیڕەوی دەکەن، واتە لە (جزء)ە وە
بۆ (کل)، دوای واتای سەرەکی بە تێکڕایی، مامۆستای
گەورەمان پەنای بردۆتە بەر نمونە و لێکۆڵینەوە و
بەراورد و بێنەو بەرەی تەفسیرە جیاوازەکان، خۆ هەندێك
جار (ترجیح) اتەکانی خۆیشی بە بەڵگەوە خستۆتە
ڕوو، واتە مەلای گەورە بەم ڕێبازەی دەستی لە خوێنەر
بەرنەداوە، تا گەیاندویتیە ڕۆخی دڵنیایی کە تێگەشتنە،
هێنانی شیعرو هەندێك نموونەی جوانی ئەدەبیی یان
کۆمەلایەتی، یان مێژوویی بۆ تەفسیرەکە بەشێك بووە لە
فەنتازیای کەسێتی خودی خۆی، بۆ تێرکردنی برسێتی
خواستە هەمیشەییەکانی، کە لە زانست و مەعریفەی هەمە
جۆردا خۆی دەبینێتەوە.

١١- تەفسیرەکەی بێ بەش نەکردووە لە قسەی
خۆش و ڕووداوی کوردەواری و تەنانەت شیعری
فۆلکلۆریشی بەکاربردووە، لەوە دەچێت مەلای گەورە
ویستبێتی ئەوەی لە دڵیایەتی بە خوێنەری بڵێت و هیچی
نەهێڵێتەوە، گرنگ ئەو توانا لەبن نەهاتوویەتی لە بواری
تێکەڵکردنی بابەتە دوور لەیەکەکاندا، لە دەرگادانی
ئەو هەموو بوارە، لەو ئاستە شارەزاییەدا، جۆرێکە لە
پیادەکردنی مەوسوعیەت لە بەرزترین وێناکردندا.
مەگەر هەر خۆی توانیبێتی ڕاڤەی قورئان و قسەو
ڕوداوی کوردەواری و فولکلۆرو پەندی پێشینان و
شیعرو دەرهێنانی لە تافەتی فرە مەوداو وشە ئارایی
تێکەڵکاو خوێنەریش لەو نێوانەوە ئاسودەکات، لە ڕاڤەی
ئایەتەکانی سورەتی (القدر)ەوە دێتە سەر هەندێك
چیرۆکی مەڕ تەورات و لەوێوە ئەیبەستێتەوە بەوەسفی
ئافرەتێکی کورد لە شیعرێکی فۆلکلۆریدا:

**هەروا دەڕوا شیلان شیلان (٢٧)**
**چارۆکەی ڕەش لەسەر پیلان**
**بەخۆی یەك و دۆستی چلان**

بۆ ڕاڤەی ئایەتی (فآما من ثقلت موازینه فهو فی عیشة
راضیة) چیرۆکێکی خۆش دەهێنێتەوە کە وێنای مرۆڤە
بۆ دەرەنجامەکانی ئەو ئایەتە، دەڵێت (مامۆستا مەلا
ئەحمەد کۆرە، لە (آوائل)ی (نشآت)ی (آحوال) و
(وجە) ی عەجایبی بەسەردا ئەهات فەرمووی لە سلێمانی
بووم، ڕۆژێ هاتە خەیاڵم؛ ئایا ئەو ترازوەی (آعمال)
ی پێغەمبەرانی پێ هەڵئەکێشرێ (اعمال)ی ئێمەشی
پێ هەڵئەکێشرێ؟ ئەی قوڕ بەسەرم چ عەمەلی وامان
هەیە بکەوێتە ئەو تەرازوە؟ حاڵ و وەجدی بەسەردا
دێ لە شار دەچێتە دەرێ و آخری ڕوو ئەکاتەوە
شار و ئەچێتەوە مزگەوتی گەورە، حەزرەتی کاك
ئەحمەدی شێخ بانگی ئەکا (ئاشەوان، ئاشەوان)، ئەچێ
بۆلای حەزرەتی کاك ئەحمەد، کاك ئەفەرموێ: ئایا
ئەو تەرازووەی ئەمڕۆ لەدنیا زێڕی پێ ئەکێشن؛ سڵق
و توری بەو تەرازووە هەڵ ئەکێشن. فەرمووی لە
فەرمودەکەی حەزرەتی کاك ئەحمەد هاتمەوە سەرخۆ،
دڵم داکەوت)٢٨، ئەم تەفسیرە لەبواری ڕووداوی
کۆمەلایەتی و قسەو هەڵس و کەوتی خەڵکی سفیلی
کوردەواری زۆری تێدایە و خوێنەری لێهاتوو دەتوانێت
لە نێوان ئەو بەسەرهاتانەوە کەسایەتی مرۆڤی کوردی
ئەو سەردەمە هەڵسەنگێنێ و پەی بەباری کۆمەلایەتییەکەی
بەرێ و دیراسەی دەروونی و هۆشیاری و ئەنتروبولوجی
بکات، سەیری کەن لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا کە باسی
قوربانی دەکات لە ڕۆژی جەژندا (فصل لربك وآنحر)،
چ نوکتەیەکی خۆشی کوردەواری هێناوەتەوە (چەند
ساڵ لەمەوپێش خاتونێ خێرەومەند، بە هەمشیرەی
گەورەمی وتبوو عەرضی کاکم کە، یەعنی (من)، ئەڵێن:
گاجووتێ بە حەوت قوربانی ئەشێ؛ وە هەرکەس لە
مەیدانی حەشی سواری قوربانی خۆی ئەبێت، (آما)
من ناتوانم لەگەڵ شەش کەس سواری گاجووتی خۆم
بم چی بکەم؟. وتی عەرزی بکەن هەر کەسە سواری
ئی خۆی ئەبێ، وائەبێ وەکی ئۆتومبیل زۆر تیژ تێ
ئەپەڕێ، عەرزی بەعزێك مەلایانم کرد زوبان بگۆڕن بە
گوێرەی عەقڵی ئێستا (تکلم) لەگەڵ خەڵك بکەن)(٢٩)،
واتە مەلای گەورە (مجتهد)ی سەردەمی خۆی بووەو
توانیویەتی دەقە ئاینییەکان بگونجێنێ لەگەڵ بارودۆخدا.

١٢- مەلای گەورە باڵاترین ڕووناکبیری سەردەمەکەی خۆیەتی و ئاگای لە ڕووداوە ناوچەیی و ئیقلیمیی و جیهانییەکان بووە، جارێك لە ڕێگای ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبەکانی بەغداو قاهیرەوە، جارێکی دی لە ڕێگای تاران و ئەستەمبوڵەوە، هەر بۆیە هەمیشە لەدووتوێی تەفسیرەکەیەوە، بانگەواز بۆ بیرو کرداری نوێ دەکات و هانی خەڵك ئەدات کە بە پەرۆش بن بۆ داهێنانە تەکنەلۆژییەکان و دوورکەونەوە لە خورافات و بیری کۆن و پواو.

مەلای گەورە دڵی خوێنی لێ ئەتکێ لەبەر خۆخۆری کوردو بێگانە پەرستی، ئەوەتانی لە ڕاڤەی ئایەتی (ولم یکن جبارا عصیا)وە، دەچێتە سەر هۆنراوەیەکی حاجی قادری کۆیی کە دەڵێت

**گزیری بۆ ئەجنەبی قبوڵ ئەکەن**
**نەك کەسێ لەخۆیان ببێتە ئەمیر**

ئەم زاتە گەورەو دلۆڤانە، لەنێوان ڕاڤەو لێکۆڵینەوەی ئایەتەکاندا هەستی نەتەوەیی دەجووڵێنی و پیرۆزیشی دەکات، داوای ڕزگاری دەکات، ئەوەتانێ هەڵس و کەوت و پلانی داگیرکردنی کوردستان دەخاتە ڕوو، بە تەوسەوە دەڵێت: (ئەم ئەرزە خوا بۆ بەریتانیا یا شەعبی بەنی ئیسرائیل یا فورسی قەدیم، خەلق کراوە)، مەلا موحەمەدی کۆیە، تەنیا چارەی نەتەوەی کورد بۆ ڕزگار بوون لە نەهامەتی دەبەستێتەوە بە زانست و کتێب و قوتابخانەوە، ئەوەتانێ دەفەرموێت: (کە منداڵ بووم بابم شیعری کوردی بۆ دادەنام):

**عەزیزم ڕۆژو شەو بۆخۆت بخوێنە**
**لەناو گێژاوی جەهلێدا مەمێنە**

ئەوەی کە جێگای سەرنجە مەلای گەورە، لەڕێگای چەند شیعرێکی حاجی قادری کۆییەوە دەست نیشانی جۆری زانستەکەشی کردووە:

**مەلای نادان بە عنوانی شەریعەت**
**حەرامی کرد لەتۆ عیلمی تەبیعەت**
**لەبۆیە هەرچی لەم عەردە بەدەرکەوت**
**لەزێرو زیوو پۆڵا و ئاسن و نەوت**
**بە کوللی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان**
**چیاو چۆڵان ئەنۆڕن وەك پڵنگان**
**بیان نۆڕی چیایان چۆن دەکۆڵن**
**هەتاکەی هەر ئێوە بەرماڵ بەکۆڵن؟!**

بائەوەش نەبوێرم کە لەکۆتایی ڕاڤەی گەلێ سورەتی قورئاندا، مەلای گەورە بەکوڵ و دڵ دەپاڕێتەوەو دوعا دەکات، بەڵام دوعاکانی ئاسایی و خواستی تاکە کەسی نین، بەقەدەر ئەوەی کە پاڕانەوەن لە یەزدان، بۆ ڕزگار بوونی میللەتی کورد، لە چنگی بێگانەو داگیر کەرانی کوردستان، نەك هەر ئەمە بەتەنیا، بەڵکو ڕوکردنە دنیای زانست و ڕیسواکردنی خورافات و هەڵس و کەوتی نابەجێ.

١٣- مەلای گەورە شۆڕەسوارێکی بواری کوردایەتییە، نەك بە تەنیا لە تەفسیرەکەیدا بانگەشەی بۆ بیری نەتەوەیی کردووە، بەڵکو لە شیعرە نەوازەکانیشیا، لە هەڵوێستە ڕۆژنانەییەکانیشیا، ئەم کەڵە زانایە کەلامی خودا دەکاتە مینبەری بیری نەتەوەیی و هەست و خولیاکانی لە زەمینەی تەفسیرەکەیدا شەتڵ دەکات و هاووڵاتی سفیلی کورد دەوروژێنێ، با ئەوەش نەبوێرین کە مەلای گەورە لە چینی سەرەوە بووەو دەیتوانی باسی ئەم بیری نەتەوەیی و پێشکەوتن خوازییە هەر نەکات و گوێی خۆی لێ بخەوێنێ، بەڵام هەرگیز دواکەوتوویی گەلەکەی و نەبوونی قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورد، بەرۆکیان بەرنەداوە و بە ئامان و زەمان لێی جودا نەبوونەتەوە و هەمیشە لە خولیایدا بووە و بە قەڵەم و زمان و هەڵوێستی ڕۆژنانە کاری بۆ کردووە.

بۆ ڕاڤەی ئەم ئایەتە کە باسی داهێنان دەکات (آفمن یخلق کمن لا یخلق) دەفەرموێت (نازانم چ بنووسم وەقتە دڵم تەق کا بۆ اسلامەتی بۆ قرآن، تەماشای ئایاتی کە بۆ موسوڵمان، بۆ قەومی خۆم کوردی ماڵ وێران دواکەوتوی هەموو میللەتان، بێ علم و صنعەت.... هتد)(٣٠)، لە ڕاڤەی ئایەتی (اولئك فی ضلال بعید) ەوە گواستویەتەوە بۆ ناوزڕانی کورد بەخراپە لە لایەن بیانەکانەوە (حاکمی سیاسی کۆیە (رندیل) ناو، تەماشای ئێمەی دەکرد لە قیام و قعودو ئاداب و خواردن و لباسی ئادەمیانە تعجبی دەکرد، ئەی وت: لە مەکتەب ئێمەیان دەرس ئەدا (کورد) قەومێکی وەحشیین. آدەم خۆر، وەك گورگی هار...)٣١، لەمەڕ ئایەتی (وکان الآنسان عجولا) باسی نەوتی باباگڕ دەکات کە چۆن بە تاڵان دەبرێت (آجنبی چاویان لە هەزار ساڵ لەمەودوا بوو، ئەمڕۆ تەدابیریان بۆ (اتخاذ) ئەکرد، بۆیە نەوتی (باباگورگوڕ)یان دەرخست و حربی عوزمایان لەسەر کرد...)٣٢. دیارە مەلای گەورە لە خەمی ئەوەدایە کە چۆن ئەم سامانە نەتەوایەتییە کە نەوتە، بەتاڵان دەبرێت و هەڕاج دەکرێت.

## سەرچاوەکان:


١ - تەفسیری کوردی ل٢٦ بەرگی (١)
٢ - ل ٧٢٤، ب ١٠
٣ - ل ٧٢٥، ب ١٠
٤ - ل٤٠، ب ٥
٥ - ل ١٢١، ب ١
٦ - ل٧٢٥، ج١٠
٧ - ل ٧٢٥، ب ١
٨ - ل١٨٨، ج٥
٩ - ل٥٩٨، ب ١٠
١٠ - ل٣١٠، ج ١٠
١١ - ل٣١، ب١٠
١٢ - ل٦٨٣، ب ١٠
١٣ - ل٢٩١، ب ١٠
١٤ - ل٩٩، ب ٥
١٥ - ل٢٩٨، ب ٥
١٦ - ل٤٦، ب ٥
١٧ - ل٤٠٢، ب ١٠
١٨ - ل٦٨٤، ب ١٠
١٩ - ل١٠٦، ب ١٠
٢٠ - ل٥٩٢، ب ١٠
٢١ - ل٥١، ب ١٠
٢٢ - ل٢٩٥، ب ١٠
٢٣ - ل٣٠٤ — ٣٠٥، ب ١٠
٢٤ - ٤٠٥، ب ١٠
٢٥ - ل١١٦، ب ٥
٢٦ - ل٣١٠، ب ١٠
٢٧ - ل٥٩٢ ب ١٠
٢٨ - ل٦٢٧، ب ١٠
٢٩ - ٦٧٨، ب ١٠
٣٠ - ل ١٤٠، ب ٥
٣١ - ل٨٦، ب ٥
٣٢ - ل٢٠٠، ب ٥


**سالی ١٩٣٣ لە چەپەوە بۆ ڕاست، عەبدولڕەحمان خدر بەڕیوبەری ناحیەی تەقتەق، مەلای گەورە، ساڵح زەکی بەگ ساحێبقران،-قائیمقامی کۆیە، ڕاوەستاوەکان سەلاحەدین کوڕی قائیمقامی کۆیە، مەجید نورەدین-محەمەد خەلیفە.**

## پێشەکی:

لێکۆڵینەوە لە شیعر و شاعیریەتی هەر شاعیرێك بیگری، دەوەستێتە سەر سێ بنەمای ڕەخنەیی، ئەوانیش بنەمای مێژوویی و بنەمای سایکۆلۆژیی و بنەمای هونەرییە.
ئەگەر بنەمای مێژوویی سەردەمی ژیانی شاعیر و دەوروبەرەکەی بە چاکی نەزانین، ناتوانین پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی دابنێین. چونکە دەبێت سەردەمی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی شاعیر بزانین و لەوە بگەین کە باری سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی لە سەردەمی ژیانیدا چۆن بووە و تا چ ڕادەیەك کاری کردۆتە سەر هەست و نەست و بیر و ئەندێشەی، ئینجا دەتوانین لە هەڵسەنگاندنی شیعر و شاعیریتیدا نرخ و بەهای تەواوی خۆیان پێ بدەین.
لە پاڵ بنەمای مێژوویی سەردەمەکەیشی دەبێ ئاگاداری باری دەروونیی شاعیر بین و لە بیر و بۆچوون و هەڵوێستەکانی وردبینەوە و بزانین بەچی پەست دەبوو، بە چ کار و هەڵوێستێکی خەڵك و سەرجەم گەلەکەی دڵ و دەروونی دەکرانەوە.
بنەمای سێیەمی شاعیریەتی هەر شاعیرێکیش، بنەمای هونەرییە و دەبێ لێکۆڵەرەوەی ئەدەبیی بە دوای سەرکەوتنی شاعیرییەتی شاعیردا بگەڕێ لەڕووی هونەرییەوە، تاکو بزانێ تا چ ڕادەیەك لە داڕشتنی شیعرەکانیدا بەپێی هەلومەرجەکانی شیعری ڕەسەنی سەرکەوتووە، ئایا هەست و سۆزەکەی بەرامبەر بابەتەکەی ڕاستگۆیانەن و ئەندێشەی قووڵی تا چەند بڕی کردووە و بەرهەمەکەی تا چ ڕادەیەك لە سۆز و ئەندێشەوە هەڵقووڵاوە و تا چ ڕادەیەکیش کار دەکاتە سۆز و ئەندێشەی خوێنەر و گوێگری شیعرەکەی؟
ئێستاش بە پێی ئەو بنەما و پێوەرانە لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە لێهاتووە دەکۆڵینەوە و تیشکێکی زیاتر دەخەینە سەر شیعرە سیاسیەکانی، تاکو بزانین تا چ ڕادەیەك لە هەست و سۆز و بۆچوونەکانی لە کرداری داڕشتنی شیعرەکانی دا سەرکەوتووە؟

## مەلای گەورەی شاعیر:

مەلای گەورە لە نێوان ساڵانی ١٨٧٦ — ١٩٤٣دا ژیاوە و شاعیری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بووە، گەلێك گۆڕانکاری سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کوردستان بینیوە، و هەر لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی و جەنگی یەکەمی جیهانیی و شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستانەوە، بگرە تا دەگاتە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیی. لە سەرەتاکانی دامەزراندنی حکوومەتی عێراقیش نوێنەرایەتی کۆیەی کردووە لە ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراق لە ساڵی ١٩٢٤دا، لە سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە کێشەی کورد گەیشت، بۆی ساغ بۆوە کە ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە، چی بۆ کورد لەناو جانتاکەیدا نییە.
لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە سیاسیانە و ئاگاداری لە شیعرە نەتەوەییەکانی حاجی قادری کۆیی (١٨١٧ — ١٨٩٧)، هەستی نەتەوەیی لەلا گەڵاڵە بووە و بەهرەی شاعیریشی لەلا خوڵقاوە و ڕۆژ بە ڕۆژ ناگزووری میللەتە چەوساوەکەی هانی داوە تا چ بە وتار و چ بە شیعر، ئەو هەستەی خۆی بۆ خەڵکەکە دەربڕێ و تێیان بگەیەنێ کە هۆی دواکەوتنی میللەتی کورد بیر و بڕوای کۆنە پەرستانەیە، کە هەندێ لە شێخ و دەرویشەکان لەناو خەڵکی بێ چارەدا بڵاوی دەکەنەوە. بۆیە هەردەم لە ململانێدا بوو لەگەڵ ئەو جۆرە شێخانەی بیری نەتەوەییان لە مێشکی خەڵکەکەدا کوشتبوو.
بۆیە مەلای گەورەی زانای چاکسازمان، وەك شاعیرێکی شیعری کۆمەڵایەتی و سیاسی هاتە مەیدانی ئەدەب و لەپاڵ ئەو دوو ڕەگەزەش گرنگییەکی زۆریشی داوە بە مافی ئافرەت و یەکسانی لەگەڵ پیاودا لە مەیدانی زانست و کارکردندا و یەکەمین شاعیری کوردیش بووە کە گرنگی داوە بە پەروەردەی منداڵ لەسەر ڕێگایەکی ڕاست و دروست. بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیری بابەتی شیعرەکانی ئەم شاعیرە لێهاتووە بکەین، دەبینین شیعری سیاسی و نەتەوەیی بەسەر بابەتەکانی دیکەیدا زاڵە و ئێمەش لێرەدا دەیخەینە بەر لێکۆڵینەوەمان و شیعری سیاسیش لە شیعری کوردیدا خۆی لەو بەرگرییە دەنوێنێ کە کورد لە وجودی خۆی دەکات.

## مەلای گەورە و شیعری سیاسی:

شاعیری هۆشیار و هەست ناسکمان، مەلایەکی زانای مێشك ڕوون بوو، کاروباری ئاینی تاکە ئەرکی سەر شانی نەبوو، بەڵکو خەمی ژێر دەستی و دواکەوتوویی میللەتەکەی و پێشخستنی نەوەی نوێشی لەلا ئەرکێکی گەورە و پیرۆز بوو.
لە سەردەمی لاوێتیدا هەستی دەکرد گەلێك میللەت ڕادەپەڕن و کیانی سیاسی دادەمەزرێنن، کەچی کە

سەرنجی دەدا، دەبینی خاکی کوردستانەکەی داگیر کراوە و بۆتە پارچە پارچە و پێش جەنگی یەکەمی جیهانی بەسەر هەردوو دەوڵەتی ئێرانی قاجاری دابەش کرا بوو.
کەچی دوای بڕانەوەی ئەو جەنگە و دروستبوونی کیانی سیاسی نوێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە جیاتی دوو پارچە، کوردستان بە پیلانی ئیمپریالیزم کرا بە سێ چوار پارچە و بەسەر دەوڵەتاندا دابەش کرا و لەم ڕووەوە شاعیر دەڵێ:

**ئەم میللەتە گەورەیە و عەزیمە**
**سێ پارچە کراوە بۆتە قیمە**
**قسمێکی لە جەوری تورکی غەددار**
**هاواری دەگاتە چەرخی دەووار**
**قسمێکی لە ژێر نیری ئێران**
**سووتاوە هەناوی بۆتە بریان**
**قسمێکی لە ترسی (سووری چاوشین)**
**کەوتۆتە لیباسی ماتەم و شین**

مەلای زانای شاعیرمان لە تراژیدیای دابەشکردنی کوردستان بە سەر تورکیا و ئێران و عێراقی ژێر دەستی ئینگلیز (بەرلەوەرگرتنی سەربەخۆیی) دەدوێ، کە چۆن کورد کەوتوونەتە بەر زەبری داگیرکاری و چەوساندنەوەی ئەو سێ دەوڵەتە، بەڵام ئەوەی لەیاد نەبووە کە بەشێکی کوردستانیش خراوەتە بەر دەسەڵاتی حوکمڕانی سووریا.
شاعیری هەست ناسکی هۆشیارمان، هەردەم لەگەڵ میللەتەکەی خۆیدا ژیاوە و ئامۆژگاری ڕۆڵەکانی گەلەکەی کردووە و پێی گوتوون: «ئەم خاکەی کوردستان دایکتانە و وا کەوتۆتە دەست داگیرکەری بێگانە، تۆ ئەی کوردی غیرەتمەند چۆن بەو داگیرکارییە قایل دەبی و هەر ئێوە بێ قەدر و بێ هێزی سەربازیی و ئاڵای سەروەریی ماونەتەوە و کەوتونەتە ژێر نیری زیللەتی ژێر دەستی ئەم و ئەو بەم چەشنە ئاگاداریان دەکاتەوە:

**ئەم خاکە داکی تۆیە کەوتە دەستی ئەجنەبی**
**ئەی کوردی ساحێب غیرەت تۆ چلۆن ڕازی دەبی**

**ئێوەن بێ قەدر و قیمەت، بێ عەسکەر و بێ عەلەم**
**بێ تاج و تەخت و دەوڵەت، ژێر دەستی کوللی عالەم**

**تاکەی وەکو گاجووتی لە ژێر نیری زیللەتی،**
**سەد حەیف و سەد مخابن، لای خۆت ئەتۆش میللەتی!!**

هەر چەندە هەندێ لە سیاسەتمەدارانی سەردەمی داگیرکاریی بەریتانیا لە کوردستان، لەو باوەڕەدا بوون کە ئەو دەوڵەتە زلهێزە کیانێکی سیاسی بۆ کورد پێکەوە دەنێ، بەڵام مەلای گەورە بە پێچەوانەی بیر و بۆچوونی ئەو جۆرە کەسانە هەڵوێستی تایبەتی خۆی هەبوو دەیگوت «بەریتانیا داگیرکەری وڵاتەکەمانە نەك ڕزگارکەر، پێویستە هیچ کوردێك ئومێدی پێی نەبێ و لە هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی دا هەر پشت بە خۆی ببەستێ و بە چەکی زانین و کرداری باش بێتە مەیدانی خەبات و واز لە پۆست و زەرگی دەرویشی بێنێ، چونکە ڕۆژ ڕۆژی تۆپ و تفەنگە و چەکی نوێیە و لەو بارەیەوە دەڵێ:

**سوورەی موو زەردی چاوشین نەکەی بە ئومێدی بی**
**ئەوەڵ بە قوەتی خۆت، دووەم بە عەونی ڕەببی**

**عیلم و عەمەل خۆیەتی، جەهل و تەمبەڵی مەرگە**
**پۆست و زەرگان فڕێدەن، وەعدەی تۆپ و تفەنگە!**

لە دواییدا شاعیری سیاسەتزانمان وەك چاکە خوازێکی ئاینیی و شاعیرێکی شیعری کۆمەڵایەتی و سیاسی و وەك نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزی نەك هەر کوردستان، بەڵکو سەرتاپای کیشوەی ڕۆژهەڵات، ئامۆژگاری مەلایان دەکات کە میللەت لە دژی داگیرکەران هان بدەن کە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی ڕۆژهەڵات لە سەردەمی ئەودا داگیر کرد بوو دەڵێ:

**مەلا ئەگەر مەلابان میللەت بۆ وای لێدەهات**
**ئەوروپایی چی دەکرد لەسەر قیتعەی ڕۆژهەڵات؟**

مەلای گەورە دوژمنی داگیرکەرانی کوردستان بوو، بە تایبەتی بەریتانیا، چونکە بە هیچ جۆرێك بەرەو دامەزراندنی جیدی کیانی سیاسی کوردستان نەدەچوو، هەرچەندە لە هەندێ باری سیاسیدا کەمێك جڵەوی بەرەو حوکڕانی کورد شل دەکرد، بەڵام لە ئەنجامدا کێشەی کوردی دەکرد، بەڵام لەئەنجامدا کێشەی

کوردی دەکرد (کارتی گوشار) بۆ سەر عێراقی عەرەبی، یان دەوڵەتە دراوسێکانی وەك تورکیا و کاتێکیش دەشگەیشتە مەبەستی خۆی پشتی لە کورد دەکرد.
شاعیری هۆشیارمان هەر چەندە ڕژێمی دەرەبەگی نەدەویست، بەڵام چونکە هەندێجار هۆزێك لە دژی داگیرکاریی بیانی دەوەستان، ڕێزی لێدەنان و نرخ و بەهایەکی باشی بە خەبات و ئازایەتییان دەدا بۆ نموونە: بەڕێزێکی زۆرەوە سەیری ئازایەتی هۆزێکی کوردی وەك (میراودەلی)ی پشدەری کردووە کە چۆن سەردەمێك لە دژی داگیرکاریی عوسمانی و سەردەمێکیش لە دژی ئێران و دواجاریش لە دژی بەریتانیا جەنگاون و لە دەربەندی ڕەمکان پەلاماری سوپاکەیانی داون و ناچاریان کردوون بەرەو دواوە بکشێنەوە ڕووە و بەغدا و لەم بارەیەوە گوتوویەتی:

**تەماشای عەشرەتی میراودەلی کەن**
**بەسێ جار سەتوەتی سێ دەوڵەتی برد**
**لە ئەووەل زەربەییێکی دا لە تورکان**
**لە ئەستەنبووڵەوە لەرزی خوداوەند**
**دووەم دەردێکی دا سەرداری ئێران**
**ڕەزا خان ئیلتیجای برد بۆ دەماوەند**
**سێیەم شەققی گەیاندە هێزی ئینگلیز**
**بە بازی چوونەوە بەغدا لە دەربەند!!**

لە دواییدا دەڵێ: سەرەڕای ئەو هەموو ئازایەتییەی عەشیرەتەکانی کورد نواندوویانە، کەچی لەبەر ناتەبایی و نەبوونی هیچ جۆرە پەیمان و پەیوەندییەکی نەتەوەیی لە نێوانیاندا، بۆیە میللەتی کورد وا بەژێردەستەیی و دواکەوتوویی ماونەتەوە و لەسەر هۆنراوەکەی دەڕوا و دەڵێ:

**بەڵام چونکە لەگەڵ یەك ناتەبانە،**
**لە بەینیاندا نییە هیچ عەهد و پەیوەند!!**

کاتێك کە دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢١دا دامەزرا، ڕژێمی پاشایەتی بۆ ڕەگ داکوتانی خۆی، هەندێك لە کوردەکانی کردە (نائیب) و (وەزیر)، بۆ ئەوەی لە خەباتی نەتەوەییان بۆ کیانی سیاسی دووریان بخاتەوە و وردە وردە ئازادی و ئاو و زەوی و زاریان لێ زەوت بکات. لێرەدا شاعیری سیاسەتزانی هۆشیار، ئەم واقیعە تاڵەی بە شیعر دەربڕیوە و گووتویەتی:

**کوردی بێ تالع، هەژار و ڕەزیل**
**دەربەدەر بوون سەفیل و زەلیل!!**
**ساحێبی موڵك وماڵی خۆ نینە**
**قووڕ بەسەر کاسە لێسی خەڵکینە**
**چەند کەسێکیش بە ناوی کوردستان**
**لە وەزیر و لە نائیب و ئەعیان**
**هەموویان دار بەدەست و بەستەزمان**
**قووڕ بەسەر قەوم و قیلی کوردستان**
**نائیبی چی و وەزیری چی هەیهات**
**ئاو و عەردمان هەموو لە دەست دەرهات**

ئینجا شاعیری سەرنج تیژمان ڕوو دەکاتەوە ڕۆڵەکانی میللەتەکەی و تەماع و چاوچنۆکی دەوڵەتە ئیمپریالیستە ئەوروپاییەکانیان بۆ ئاشکرا دەکات، کە چۆن هەموویان چاویان بڕیوەتە نەوتی بابەگوڕگوڕی کوردستان و چەند شەڕ و کوشتاریان لەسەر کردووە، تاکو گەیشتوونەتە ئامانجی خۆیان و دەڵێ:

**ئەی کاکی نەفامی گەوجی مل هوڕ**
**بنواڕە لە دەوری بابە گوڕ گوڕ**
**ئەو نەوتە چ بوو چلۆن بە دەرکەوت؟**
**چۆن هەڵدەقوڵێ مەنابیعی نەوت؟**
**ئەو نەوتە بوو ئاگری هەڵایساند**
**چەند دەوڵەت و تاج و تەختی فەوتاند!!**
**بۆی هاتنە نیزاع و حەرب و کوشتن**
**تاکو بە مەرامی خۆ گەیشتن!!**
**ئەو نەوتە چ بوو؟ حەیاتی تۆ بوو**
**وەی خۆڵ بەسەرت ئەویش ئەوا چوو!**

مەلای گەورە بە ڕووناکبیریی و تێگەیشتنی سیاسی خۆی لەوە گەیشتبوو کە سیاسەت لەسەر ژێرخانی ئابووری دادەمەزرێ، وەك بۆ هەموو لایەك دەرکەت کە نەوت و کانزاکانی دیکە چ دەورێکیان بووە لە خولقاندنی بنەمای سیاسی دەوڵەتە پیشەسازییەکانی جیهان دا.
شاعیری بیرفراوانی نەتەوە پەروەری کورد، لەسەر ناگوزووری و چەوساندنەوەی هەموو کوردێك

هاتۆتە جەواب، جا لە هەر پارچەیەکی کوردستانی گەورە بوویێ خەمی بۆ خواردوون. بۆ نموونە: دوای لە ناوبردنی شۆڕشەکانی کورد لە کوردستانی باکوور لە لایەن تورکیای کەمالییەوە و لەسێدارەدانی سەرکردەکانیان، شین بۆ شەهیدبوونی ئەو خەباتگێڕە مەزنانەی کورد دەگێڕێ و دەڵێت:

**قوڕی کام جێ بگرمەوە بۆتان**
**بۆ برایانی جەزیر و بۆتان!**
**خەمی دنیا بکەین بەسەر خۆمان**
**بۆ عەزیزانی ئەرزەڕۆم و وان**

شاعیر لەپاڵ دەربڕینی هەست و سۆزی نەتەوەییشی لە ڕووی هونەریی ڕەوانبێژی شیعرییشەوە، چووە لە نێوان وشەکانی (بۆتان) و نیوە دێڕی یەکەم و (بۆتان) ی نیوە دێڕی دووەمی بەیتی یەکەمیدا، ڕەگەز دۆزییەکی تەواوی پێکەوە ناوە و ناوەڕۆکی شیعرەکەی لەڕووی هونەرییەوە ڕازاندۆتەوە.
دیسان شاعیری خەمخۆری میللەتەکەی لەسەر هەمان بابەتی لە ناوبردنی میللەتی کورد دەڕوا و لە کوشتن و بڕی حکومەتی عێراق دەدوێ کە چۆن لە ساڵانی ١٩٣١ و ١٩٣٢، بە هەموو چەکێکی دوابڕ شۆڕشگێڕانی شۆڕشی یەکەمی بارزان و خێزانیانی جینۆساید کردووە، بە وردی ئەو کارەساتە دەگێڕێتەوە و بەمەش یەکەم شاعیری کوردە لەسەر ئەنفالی کوردی نووسی بێ هەروەك دەڵێت:

**ژیانی وا بە ئالام و بە میحنەت**
**بەلەعنەت بێ بەلەعنەت بێ بەلەعنەت!!**
**سەما ئەم ساڵ لە جێی بارانی ڕەحمەت**
**دەبارێنێ قوڕ و خۆڵی مەزەللەت**
**بەهاریش ئەلبیسەی شینی لەبەر کرد**
**نە گوڵ پشکوت نە بولبول چەهچەهەی کرد**
**چ قەوماوە لە دنیادا خودایە؟**
**چ شینێکە لە بۆ کێ داندرایە؟**
**بەڵێ ئەم شینە شینی قەومی کوردە**
**قیامەت ڕابووە لەم دار و بەردە!!**

شاعیرمان لە هۆنینەوەی شیعری سیاسی و بە تایبەتی لەم هۆنراوەیەیدا، سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هیناوە، چونکە نەچووە بیر و باوەڕی سیاسی لە قاڵبی دروشمدا دەربڕێ، بەڵکو لە قاڵبی وەسفێکی جوان و وێنەی ناسکی شیعری سەرەتای هۆنراوەکەی ڕازاندۆتەوە، ئینجا لە هەنگاوی دواتر چۆتە ناو وردەکاریی ڕووداوەکان و ئەنجامەکانیان و لەم هۆنراوەیەیدا پیادەی کردووە هەر وەك دەڵێت:

**هەزار منداڵ و ژنیان سەر بڕیوە**
**هەزار کیژی عەفیفیان زگ دڕیوە**
**بە بۆمبا خاك و مانیان بوو بە وێران**
**مەڕوماڵیان هەموو ڕۆیی بە تالان**

ئەم کارەساتەی کە شاعیر دەیگێڕێتەوە، بە زێدەوە ڕوویداوە و ئەنفال کردنێکی بی ویژدانانەی میللەتی کورد بووە لەو سەردەمەی ژیانی شاعیری زانا و هۆشیارمان، کە حکومەتی ئەوسای عێراق ئەنجامی داوە.
مەلای گەورە وەك زانایەکی چاکساز داوا لە ڕۆڵەکانی میللەتەکەی خۆی دەکات بۆ پێکەوەنانی بەرەیەکی یەکگرتوو، هەر لە خاوەن قەڵەم و ڕووناکبیرانەوە تا دەگاتە خاوەن چەك، تاکو یەك دەنگ و یەك ڕەنگ لەڕووی دوژمنانی کوردستان و چەوسێنەرانی کورد بوەستن و گیانی میللییان لەوپەڕی بەهێزیدا بێت، ئینجا داوایان لێدەکات کە هەوڵ و خەباتیان هەر بە قسە نەبێ، بەڵکو پێویستە بە چەکی تازە خۆیان چەکدار بکەن، چونکە گەورەیی بەبێ چەکداریی نایەتە دەست و داوایان لێدەکات بە غیرەت و مەردانە بێنە نەبەردیی و ئازایەتی و بەرخودان و دەڵێت:

**دەبێ میللەت هەموو یەك بێ لەگەڵ یەك**
**لە ئەربابی قەڵەم تا خاوەنی چەك!!**
**ئەگەر کوردێك ئیهانەی کەن لە بەسرە**
**هەموو بێنە خرۆش و جۆش و نەعرە**
**هەتا حەقی نەسێنن ڕانەوەستن**
**لەبەر بێ ئیتفاقی خوار و پەستن**
**هەوایی گەورەیی دەرکەن لەنێو سەر**
**بەبێ تۆپ و تفەنگ و ماڵ و عەسکەر**

بەم جۆرە مەلای گەورەی شاعیر، وەك زانایەکی ئایینیی چاکە خواز و شاعیرێکی نیشتمان پەروەری بەجەرگ و سیاسەتمەدارێکی ئەوسای کورد، ڕۆژانە لەسەر ئامۆژگاری کردنی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی دەرۆیشت و ئەنجوومەنی تایبەتی خۆی و مینبەری

مزگەوتی گەورەی کۆیەی کردبوو بە قوتابخانەیەکی زانستی و ڕووناکبیری و دەستە بە دەستەی خەڵکی شار و مەڵبەندەکانی دەور و پشتی، وانەی چاکسازیی و نیشتمانپەروەریی لێوە فێر دەبوون، بۆیە بە نەمانی ئەو زاتە پایە بەرزە لە ڕۆژی ١٩٤٣/١٠/١٢دا، گەلی کوردمان زانایەکی ئایینیی مەزن و چاکسازێکی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ و شاعیرێکی میللەت پەروەری لە دەست چوو.

**ئەنجامی باسەکە:**

مەلای گەورە زانایەکی مەزنی ئایینیی چاکساز و شاعیرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناسراوی کورد بووە، لە نێوان ساڵانی ١٨٧٦ – ١٩٤٣دا ژیاوە، کە سەردەمانێکی ناسکی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد بووە.

مەلای گەورە جگە لە دانانی زنجیرەیەك لە کتێبی ئایینیی و کۆمەڵایەتی، دیوانێکی شیعری کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و سیاسی و پەروەردەیی لەپاش بەجێماوە و چەند جار چاپکراونەتەوە، دەورێکی زۆریان بووە لە ڕۆشنکردنەوەی مێشکی خەڵکەکە.

لەسەردەمی ئەو ئیمپریالیزمی بەریتانی، هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بە کوردستانی باشوورەوە داگیر کرد بوو، دەستی بەسەر خێر و بێری ئابووری وڵاتەکەیاندا گرتبوو، لەپێناوی نەوت، هەموو کارێکی ناڕەوای بەرامبەر بە کورد کرد و لە کیانی بێبەش کرد، بۆیە گەلێك شیعری لە دژی ئەو داگیرکەرە داناوە.

مەلای گەورە یەکەمین شاعیری کورد بووە لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمدا لە جینۆساید کردنی بارزانییەکان دوواوە، لەو کاتەی کە سوپای عێراق بە تۆپ و فرۆکەی شەڕکەر لە پێشمەرگەکان و ژن و منداڵی ئەو شۆڕشگێرانەیان داو زۆربەیانی لەناو برد و ئەسیر کرد.

بەم جۆرە مەلای گەورە وەك کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناسراوی کورد، لە سەردەمەکەی خۆیدا ژیا و دەورێکی گەورەی بینی لە هۆشیارکردنەوەی میللەتەکەی لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مافی ئافرەت و پەروەردەی منداڵەوە، بۆیە ئێمە لەم باسەماندا پتر تیشکمان خستە سەر ئەم لایەنەی یەکەم و دووەم، چونکە لە شیعرەکانیدا پانتاییەکی گەورەیان داگیر کردووە.

دەبێ پێش ئەوەی شیعرەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە بڵاو بکەمەوە، بەسەر ئەوەدا نەڕۆم کە لە (م. و) دا، چەند شوێنەواری مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەم دیوە، لێرەدا ناونووسکردنیان دەبێت بە زیادە.

**ڕوونکردنەوەی بەرهەم و ژیانی مامۆستای جەلی.**

١- لە دەستخەتی ژمارە (١١/٤٣٣٦١م. و) دا، فەتوایەکی ئەم مامۆستایە هەیە لەبارەی ساڵی باڵغبوونی کچەوە بە شایەتیی — شایەتی جیا — جیا.

٢- دەستخەتی ژمارە (١١٩٣٩ م. و) ش، دانراوێکی ئەم مامۆستایە لە بەیاندا.

٣- دەستخەتی (٣٠٤٥١ م. و) یش، دانراوێکی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلییە بە ناوی (تحفة الطلاب شرح خلاصة الحساب). محەمەدی کوڕی حاجی ئەبوبەکری بانەیی وەقفی کردووە. دەستخەتی (٣٦٦٧٨) ش نوسخەیەکی تری ئەو کتێبەیە.

٤- مەولوودنامەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جەلیی، چەندان نوسخەی لە کتێبخانەی ناوبراودا پارێزراوە، ئەمە ژمارەی هەندێکیانە:

(١٤٥٢٩) نوسخەیەکی باشە ئەحمەدی یادئابادی ساڵی ١٣٤٤ بۆ مەلا ئەحمەدی شەقڵاوەیی نووسیوەتەوە.

٥- نامەی مەلا عەبدوڵڵا بۆ شێخی ضیائەدین سێ ژمارە و سێ دانەی هەیە کە ئەمانەن:(٢/٢٦٠٩٥، ١٨١٩٣، ١/١٤١٩٩).

## کەلامی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە

**(یا سید الرسل) چە غەریبە حیکایەتم؟**
**(یا هادی السبل) چە عەجیبە شکایەتم؟**
**ئەدبار و ڕووسیاه و فەقیر و قەلەندەرم**
**بێ فیکر و ذیکر و هۆش و (قلیل البضاعتم)**
**بیللاهی دڵ فیگار و موبەڕڕام لە خولقی چاك**
**تەڵڵاهی شەرمەسار و موعەڕڕا لە طاعەتم**
**بۆ مەدحی ئەهلی فەقر زوبان لاڵ و ئەبکەمم**
**وەقتی ئەنای ئەهلی غینا پڕ فەصاحەتم**
**عومری عەزیز بە جیفەیی دنیا تەلەف بوو**
**بێ قووت و بێ زەخیرەی ڕاهی قیامەتم**
**سەر تا قەدەم وجوود نوحووسەت قەرینی من**
**چاکیی تیا نییە، هەموو عەیب و قەباحەتم**
**بۆ ڕاهی ئاخیرەت بە میثلی موور سست پام**
**بۆ تۆشەی جیهان سەگ و ضەیغەم مەهابەتم**
**گەر چە عەمامەکەم سپییە و پێم دەڵێن مەلا**
**قەلبم ڕەشە میثالی (قشەی!) بێ هیدایەتم**
**هەنگامی دەرس خوێندن و قورئان بەبێ درۆ**
**مەفهوومی ئایەی قەمطەریر و عەبووسە قیافەتم**
**وەقتی نیفاق و غەیبەت و تەزویر و ئیفتیرا**
**بە دائیم لە صەدری مەجلیس و ئەیوانی عیزەتم**
**موونەوەرە هەیکەلی زلم و قامەتی بڵند**
**مەعنام گەلێ بچووکە دەنی و پەستە هیممەتم**
**نەم ماوە چارە ئەی دڵ پڕ غەم چە قوڕ بکەم(!)**
**هەردەم هەناسەکێشی غەم و دەرد و حەسرەتم**
**ئەی شاهی ئەنبیا و دوڕ سەری تاجی ئەولیا**
**ڕەحمێ بە حاڵی من کە سەگی خاکی دەرگەتم**
**حیفضم بکە لە وسوەسەی دێوی لەعنەتی**
**چونکە فەقیری تۆ و دۆعاگۆیی ئوممەتم**
**مەمخە چنگی حوکمی هەوا و دەستی نەفسی بەد**
**گەر هیچ نییەم لە زومرەی ئاحادی میللەتم**
**بگرە بە لوطف و مەرحەمەت دەستی ئەم سەگە**
**هەرچەند خەسیس و پیس و سزاواری نەفرەتم**
**بەشەقی چەهار یاری گوزین و موبارەکت**
**ئاگات لەمن بێ وەقتێ سەفەرگاهی ڕیحلەتم**
**ئیمان لە شەڕ و شۆڕشی شەیتان خەلاص بکەم**
**شەرمن نەکەی بە داوەت جاندانی سکرەتم**
**جێگەم بکە لە شاری شەفاعەت لەڕێی خودا**
**قوربانی دارو بەردو زەن و مەرد و طیبەتم**
**خوڕەم بکە لە ڕۆژی جەزادا بە ڕووی سفید**
**چونکە فیدای (وادەی ڕوضای!) ڕەوضەتم**
**دوورم بخە لە ئاتەش و بم ئاوی ناو بەهەشت**

**مات و مەلوول کە دوژمن بێ دین و دەوڵەتم**
**مەطران و جاشلیق و قەشە ئوسقوفی لەعین**
**شادان مەکە بە ضەرب و ئیهانە و سیاسەتم**
**صەد جار سەگێکی پیس و گڕوێم هەزار شوکر**
**چونکە سەگی محەمەد و ئەصحابی عیزەتم**
**وەرنە (جەلی) چە حەددی تۆوە ئەم شکایەتە**
**بۆ خۆی دەزانێ حاڵ و حەواڵ و حیکایەتم**

## کلام حاجی ملا عبدالله کوی

تا بکی ای دل اسیر نفسی بی پرواستی؟
مائل جا هو جلال و طالب دنیاستی
بهر دنیا هر زمان در گردش و در کوششی
غافل از ترتیب اسباب رەعقباسی
روبروی اهل دنیا پشت بر ارباب فقر
(فی المثل) مهر غنارا هم سر حرباستی
در منام و غیبتی دور از مقامات شهود
غرق بحر لاستی بی کشتی الا ستی
بهر تکلیفات عقبا همچو موری سست پا
بهر تحمیلات دنیا اشقر شش پاستی
کس ندیدی زین خراب آباد دنیا پایدار
بگذری از وی اگر اسکندرو داراستی
میروی عریان سوی ملك بقا ای پادشه
گر چه فارغ در لباس اطلس و خاراستی
میخورد کرمان وجود نازکت در گور تنگ
گر شهی گر مانیو گر والی والاستی
میشوی در زیر قاف قبر پنهان بیگمان
گر سلیمان زمانستی و گر عنقاستی
زار میگردی بزیر پنجهء شیر اجل
گر ملای پر بلا گر شیخ و گر آغاستی
چون سموم قهر مردن میوزد بی اختیار
خشك لب جان میدهی گر برلب دریاستی
لشکر شاه اجل هنگام ضرب و گیر و دار
میربابد جان ز تن گر پیر اگر برناستی
سائیلان قبر با گرز گران آتشین
(یسآلان عنك) گر سلطان تخت آراستی
می بکوبندت مثال پتك آهنگر یقین
گر گنویی بی غلط دردم جواب راستی

بەشێك لە دەستنووسەکانی مەلای گەورە

روز رستاخیز چون بینی زهر سو ولوله
مست و حیران میشوی گر عاقل و داناستی
دفتر عصیان سیاه وصفحهء رویت سیاه
در میاه رو سفیدان چون سگ رسواتی
گاه آفتی گاه خیزی غرق دریای عرق
گوییا مست مدام نشئهء صهباستی
می کشندت چون خر مرده بمیدان حساب
می نیاری دم زدن گر خود خری عیاستی
از زفیر نار دوزخ وز شهیق دوزخی
صعقهء میگیردت گر حضرة موسا ستی
نیست امید نجاتت از حساب و وز عذاب
گر نه خاك پای شاهی تخت او ادنی ستی
احمد مرسل محمد آنکه امکان ز ابتدا
بهر ایجاد جنابش از عدم برخواستی
ای شفیع المذنبین وی چاکرت روح الامین
خزنەدار مخزن اسرار (ما او حی ستی)
جمع شد در سینه ات انوار علم لا یزال
عالم علم محیط (علم الاسما) ستی
با سموم قهر تو جنت شود بئس المصیر
با نسیم لطف تو دوزخ فرح افزاستی
داعی ایجاد عالم از کمیننیگاه عدم
بانی اصل واساس سنت غراستی
قبهء خضرا عجوز آسا بگرید روز شب
چونکه فخر و آبروی تودهء غبراستی
رتبهء ادناترین خادمان روضه ات
برتر از نو آسمان (جنة المآوی) ستی
وارث نور و بهای انبیای مرسلین
باعث کری بنای شوکت کراستی
با بکەم تەعدیلی نەضم و قافییە و رەویەی عەرووض
بەم زبانە هیچی تر شیعرم لە بۆ هەڵناستی
بیکەمە کوردیی زبانی خۆمە چاکی تێ دەگەم
خوایە تەوفیقم بدەی من بندە تۆ مەولاستی.

# مەلای گەورە و کوردایەتی

بەڕاستی غیرەتی دەوێ پیاو دەگژ بابەتێك ڕابچێ لەسەر زانایەکی گەورە.. زاتێکی ئایینیی، کۆمەڵایەتی، لایەنگیری نەتەوایەتی، کە بە واقیعی لە ڕادەیەکی بەرز و عەقڵییەتێکی کراوەی فراوان و بیرێکی تیژ و خاوەن مەعریفەتی گشتگیر ئاگادار لە هەموو بابەتەکانی ژیان و ژیاری میللەت و نەتەوەکەی، ئەویش جەنابی مەلا محەمەد جەلی زادە.. ناسراو بە مەلای گەورەی کۆیە. لەبەر پایەی زانستی و زانیاری دەوری کۆمەڵایەتی، ئەم نازناوەی لێنراوە.

دیارە باس لەسەر ئەم کەڵە مێردە هەڵدەگرێ کتێب بروانامەی گەورەی لەسەر بنووسرێت و بکرێت، وە گەر لە هەموو کون و کەلەبەری ژیانی و توانا و غیرەت و بەرهەمەکانی بکۆڵینەوە بێ تەوازع نواندن.. ئێمە سوار چاکی ئەم مەیدانە نین.. جا بۆ ئێمە تەنها لە لایەنێکەوە سەیری کەسایەتی ئەو دەکەین تا ڕادەیەك لەگەڵ ڕەوشەنبیری و کولتوورزانی ئێمە بگونجێ، هەوڵدەدەین لەم دەرگایەوە ئەوەندەی بۆمان بلوێ مافی خۆی پێبدەین، وە هەموو ئەم مێژوو و ڕووداو و کەش و هەوا و زەمینەی دروستبوون و خولقانی ئەم کەسایەتییە ئاشکرا بکەین، تا بزانین ئەم پیاوە لەگەڵ زیرەکیی و بلیمەتیی چۆن توانیوویەتی بەم قۆناغە بەرزە بگات و بچێتە خانەیەکی بڵند لە مێژووی میللەتەکەی و شارە دێرینەکەی.

کۆیە و جەلی زادە هۆ و هۆکارن بۆ یەکتر (سبب و مسبب)..

ئەگەر کۆیە نەبا، جەلی زادە بەو پایە نەدەگەیشتن، گەر جەلی زادەش نەهاتبانە کۆیە، کۆیەش ئەو خەرمانە زانستییەی لێ سوور نەدەکرا.

جا گەرچی بەهرەدار و هەڵکەوتوو و بلیمەت و بنە بێتولەکان لە هەموو کات و شوێن و ڕۆژگار و سەردەمێکدا بن، دەتوانن دەرکەون، دەور بگێڕن، لەکوێوە بۆیان لوا، جڵەو بگرنە دەست، کورد وتەنی (خەنجەری دەبان خۆی لەکالاندا ڕاناگرێ).

بەڵام کەسیش بۆی ناکرێ و نابێ و ناتوانێ لە زەمینە و کەش و هەوای ڕسکان و خولقان و پێگەیشتنی دوورکەوێتەوە لێ ڕووت بێتەوە کاریگەری لەسەری نەکات، هەر بۆیەش باس لەسەر جەنابی مەلای گەورە کە چواریەکی دوایی سەدەی نۆزدەهەم هاتۆتە دنیاوە، دەبێ ئاوڕێك لەو سەردەمەی کوردستان و کۆیە بدەینەوە، تا بزانین چۆن هۆکار و ڕووداوەکان تێکەڵی ژیان و ڕەفتاری ئەم بلیمەتە کوردە بوون.

دیارە دەزانین ئەم وڵاتە ئەوی ڕۆژێ بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك، گەرچی ئەم دەوڵەتە زلە بەرەو داڕزان و دەردەداری دەچوو، چاوی تەماحی دنیای لەسەر بوو. بەڵام هەندێك لە سوڵتانەکان هەوڵی نوێ بوونەوە و بە عەسریبوونی دەوڵەتەکەیان دەدا، بەم شێوەیەی لە بەرژەوەندی ئەواندا بێت و خۆیان بەهێزی بکەنەوە. دەزانین دوای شەڕی چاڵدێران لە سەرەتای سەدەی شازدە لەسەردەمی سوڵتان سەلیم و مەلا ئیدریس بتلیسی، چەند ئەمارەتێکی نیمچە ئۆتۆنۆمی کوردی دامەزران، بەڵام سەردەمی سوڵتان مەحموودی دووەم، بە بیانووی نوێ کردنەوە و دەسەڵاتی ناوەندی، هەوڵی لەناوبردنی ئەم دەسەڵاتانە دراو یەك لەدوای یەك لە ناویان بردن، تا تەواوبوونی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم هیچیان نەمان، کەواتە هاتنە دنیای مەلای گەورە لە سەردەمی نەمانی ئەمارەتە کوردییەکان بوو، ئەمەش کاریگەری لەسەر هەموو لایەنێکی ژیانی خەڵکی کورد جێهێشتووە، ئەو لە ساڵی ١٨٧٦ لە دایکبووە.

بەڵام وەك سیاسەتی ئیدارە کردنی کوردستان، بەهۆی چەند هۆیەك کە ناکرێ لێرە باسیان بکەین، بەڵام بەهێزترینیان سروشتی جوگرافی کوردستان، نەدەکرا ڕاستەوخۆ بێ بەشداریکردنی خەڵکی وڵاتەکە ئیدارە بەڕێوە بچێت، هەر بۆیە ڕوویان کردە شێخەکانی تەریقەت، بەڵام چونکە جوڵانەوەی نەتەوەیی بە نەزمێکی بابەتیی خۆی دەخولقاند، بەتایبەتی لەو سەردەمە، بۆیە بەشێکیش لەم شێخایەتییانە ئاڵای سەربەخۆییان هەڵکرد، لە هەموویان گرنگتر شێخ عوبێدوڵڵای نەهری. ئەوانەشیان سەرکوت کرد، لەجێی ئەوە سوارەی حەمیدیان دروست کرد، گوایە بۆ پاراستنی دەوڵەتی عوسمانی ئیسلامی لەو خەتەرانەی کە دەوڵەتە دراوسێ گەورەکانی دەست دەخەنە ناو هەناوی دەوڵەتەکەیان، بەشێکی زۆریان ئەم سوارە حەمید، عەشایەری کورد بوون، دوای ئەوەش ئینقیلابی (اتحاد و ترقی) ١٩٠٨، ئەم حیزبە بەڕووالەت خەلافەتی هێشتووە، بەڵام خۆیان هەموو شت بوون و وڵاتەکەیان تووشی شەڕی جیهانی کرد بە هاوپەیمانی ئەڵمان و میحوەر، شەڕ کارەسات و مەرگەساتی گەورەی بەسەر وڵاتەکەدا هێنا، ئەم زنجیرە ڕووداوانە تێکەڵی ژیانی خەڵکەکە و ئاسەواری لەسەر جێ هێشتووە.

دیارە کۆیەش لەپێشدا ماوەیەك خۆی سەنتەری ئەمارەتی سۆران بوو، دواتر هەر لەژێر دەسەڵاتی میرە کوردیەکانی ئەردەڵان و سۆران و باباندا بووە، تا ساڵی ١٨٤٨ لە شەڕی ئەسکی کۆیە کەوتە ژێر دەستی ڕاستەوخۆی

عوسمانییەکان، ئەمەش لەگەڵ دەرئەنجامی نەگەتیڤی (سەلبی) لە ڕووی نەتەوایەتییەوە، بەڵام جۆرێك لە ئارامگیری ئیدارەی هێناوە و دام و دەزگای حکوومەت: شارەوانی، تاپۆ، بەریدی لێ دامەزراوە وەك قەزایەکی حکومیی.
بەگشتی ئەم سەردەمە بوون پێگەیشتنی مەلای گەورە، دیارە کۆیەش وەك دەمێکە پێناسەم کردووە کە ئاوێتە بونێکی شارستانی (التفاعل الحظاری) تێدا هاتۆتە کایەوە و خەسڵەتی شاری وەرگرتووە، چەند قۆناغێکی پێشکەوتووی بڕیوە بەرێژەی ئەوێ ڕۆژگار لە ڕواڵەتی شارستانیدا پەیوەندی بە عەشایەریەکانی تێدا لاواز بوو، بووە شێوەیەکی نوێ لە پەیوەندی نێوان خەڵك، کۆمەڵانی لێ دروست بووە، ئەویش لە دەرئەنجامی پەیدابوونی و دەرکەوتوو لە پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان، پیشەگەری و بازرگانی.
شاری بەهات و بات و گوزەر و بازاڕ، مزگەوت و خوێندنگە کە لە شوێنە سەرەکییەکانی کوردستان بووە لە خوێندنگەی ئایینی.
هاتنی بنەماڵەی جەلی بۆ کۆیە، هەم ژینگەی زانستی شارێکی وەك کۆیە بە پیت و بەرەکەت ترو خێردارتر بوو لە گوندی جەلی، هەم خێزانەکە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و زانستییەوە چوونە قۆناغێکی پێشکەوتوتر.
مەسەلەیەك هەیە لە گۆڕین و پێشکەوتنی ئەم بنەماڵە، زۆر تا کەم ڕەنگە کاریگەر بوونی لە خەملاندنی بیری نەتەوایەتی لایان، کە هەرنەبێ وەك وەفایەك کە ئەم کۆچ و گواستنەوە بۆ شار لەسەر دەستی میرێکی کوردی بووە، کە عەبدولڕەحمان پاشای بابان بووە، وەك وتمان لە ڕووی دەروونی و وەفاداری لە قووڵایی هەستی ئەم بنەماڵە هەستی نەتەوایەتی ڕوواوە، ئەم تایبەتمەندییە دیارە، چونکە زۆربەی دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندانی کوردەواری لەژێر سایە و سێبەری دەوڵەتە داگیر کەرەکانی کوردستان بووە، ئەمە حاڵەتێکە تایبەتییە، ئەم میرەش لەناو میرەکان، تا لەناو میرەکانی بابانیش، وا مەزەندە دەکرێ کە عەبدولڕەحمان پاشا هەستێکی قووڵی نەتەوایەتی هەبووە، لەو سەردەمەشدا شۆڕشی فەڕەنسا بە بیروباوەڕی نوێ بۆ ئازادی و یەکسانی گەلان ڕوویداوە، وە کەم تا زۆر ئەو باوەڕە لای میریش ڕەنگی داوەتەوە، هەر لەو سەردەمەیشدا قوتابخانەی شیعری کوردی (نالی — سالم — کوردی) سەری هەڵداوە، وە عەلی بەردەشانی شاعیری دەربارەی میر بووە.
هەتا لەو کتێب و تەفسیرەی، خەلاتی جەلی زادانی کردووە، ئەم زەویانەی پێداون.. نووسراو بۆ خۆیان و کوڕو نەوەیان و هەموو زانایەك لەسەر ئەرزی کورد. جارێکی تر دەڵێین.. شاری کۆیە مەڵبەندێکی گونجاو بوو بۆ هەڵکەوتن و دەرکەوتنی مەلا محەمەد جەلی زادە و زیاد لەوەی ئەم بنەماڵەیە هەر لە جزیر و بۆتانەوە، تا بێگەلاس و شیواشان، جەلی کۆیە، پشتاو پشت مەلا زادە و خاوەن خوێندگەو فەقێ و مەکتەب و کتێب بوون، چ جای ئەوەی لە کۆیە لەم ژینگە زانستییە نیشتەجێ بوون کە مێرگێکی فراوانی زانست بووە.. ئینجا ژیانی مەلای گەورە پێش جەنگ و دوای جەنگ.. لەم جەنگەدا دونیا سەراوبن بوو.. ئەورووپا و ڕۆژهەلات تێکەڵ بوو.. کوردایەتیش چووە قۆناغێکی ترەوە.
حیزبایەتی پەیدا بوو، شەریف پاشا چووە کۆنگرەی سوڵح و شێخ مەحموود مەملەکەتی دامەزراند، دواتر زنجیرەیەك شۆڕشی لە ئاگری داغ، دەرسیم، بارزان، شۆڕشی دەستوری مشروگیهتی ئێران، دەستووری عوسمان ٩٠٨ شۆڕشی میللەتان بۆ ئازادی عەرەب و دامەزراندنی تورکیای نوێ، ئێرانی بەهلەوی.
ئەمانە لەگوێی خەڵکدا ئەزرینگانەوە، بۆن و بەرامی نەتەوایەتییان دەپرژاند.
پێشتریش هەندێ لە زانا موسوڵمانەکان، بۆ زیندوو کردنەوەو گونجاندنی هزری ئیسلامیی، لەگەڵ ئەم عەسرەدا، لەوانە جەمالەدینی ئەفغانی، شێخ محەمەد عبدە میسری، لە عێراق جەمیل زەهاوی هیبت الله شارەستانی.
مەلای کوردیشیان بە خەبەرهێنا و هۆشیارکردەوەو چوون مامەلەت لەگەڵ ئەم عەسرەدا بکەن، لەبیریشمان نەچێت لەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی نێوان جەلی زادان و شاعیرو ڕابەری بیری نەتەوایەتی حاجی قادری کۆیی، کە هاوڕێی حاجی مەلا عەبدوڵڵا، باوکی مەلای لە چەند دیاردەیەك دیارە، لەو شیعرەی بۆ حاجی مەلا عەبدوڵلای ناردووە:

**شەوێ دانیشتبووین بێ شەمع و مصباح**
**ئەتووی هێناوە یادم کاکە فەتتاح**
**وتی با نامەیەکی بۆ بنێرین**
**ڕەفیقی کوتەیە بە ئامرازی دێرین**

یا دەرحەق بەو بنەماڵەیە دەفەرمووێ:

**بە غەیری جەددی ئێوە کیهە دانا**
**لەکوردستان ئەساسی عیلمی دانا**

زیاتریش لە ڕێگەی ئەو بنەماڵەیەوە شیعرەکانی هاتوونەتە کۆیە، خوێندراونەتەوە و لەبەر کراون، سەرتوێی مەجلیسان بوون، گەر لە شیعرەکانی مەلای گەورەش ورد بینەوە بە ئاشکرا شیعرو بیری حاجی قادریان پێوە

دیارە، دوایی بە نمونە باسیان دەکەین، جا ئەگەر حاجی کوردایەتی لە بیری خەڵکی کوردستاندا وروژاندبێ، لەکۆیە ئەم پرۆژەیەی هەستی هەژاندو بە توندی بیری خەڵکی ڕاشەقاندووە، مەلای گەورە بۆتە شاگردێکی بلیمەتی ئەم ڕێبازە بە ڕەفتار و شیعرەکانی دەیسەلمێنێ، دیارە جیاوازی ئەم دوو کەڵە ڕێبەرە ڕەنگی داوەتەوە لە هەڵوێست و لە شیعریاندا، حاجی بێ کورو بیماڵ و مآوی، هەروەك حەزرەتی عیسا حاجی لە ئەستەنبووڵ ژیاوە، مەلا لەناو ڕووداوەکانی کوردستان و کۆیە دەوری ئیداری و سیاسی و زانستی بینیوە، خاوەن موڵك و بەرژەوەند بوو، دەرحەق بە هەڵوێستەکان بە پیاوێکی واقیع بینی دەزانم دواتر باسی دەکەم.
دیارە هاتنی ئەوروپییەکان بۆ ڕۆژهەڵات و موعجیزەی تەکنەلۆجیا، ئەوان تێکەڵاو بوون و ئاوێتە بووی شارستانیەتەکان (تفاعل الحضارات)، ئێستا هەندێك پێی دەڵێن (تصادم الحضارات) خەڵکی لای ئێمەیان لە خەوی هەزاران ساڵدا ڕاپەڕاند حاجی دەڵێ:

**سەفەر کەن ئەندەروەتەن چ کەلکتی دەگرێ**
**سەیری ناکەی وا شەمەندەفەر دەفڕێ**

ڕابەرانی گەلانی ڕۆژهەڵات دروستبووی دەوڵەتە نەتەوەییەکان بەتایبەتی و دراوسێکان، خەباتی خەڵکی چین و هیند بۆ ڕزگاری مەلای مە دەفەرمووی:

**منیش هەروەکو غاندی**
**هەناسە سوارو ماندی**
**لە قەومی کوردو هیندی**
**ئەوەی خێربێ نەماندی**

قەت دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کە دروستبوونی مەملەکەتی شێخ مەحموود لە سلێمانی، تەقینەوەیەکی لە بیرو هۆشی کورداندا کرد، کە جارێکی تر کورد باوەڕی بەخۆی بێت، کە مافی هەیە دەشتوانێ حکومەتی سەربەخۆی خۆی دروست بکات.
حکوومەتی شێخ مەحموود و جمهوریەتی مهاباد (ئەمەیان مەلای پێ ڕانەگەیشتون)، دوو ئیلهام بەخش بوون لە سەدەی ڕابردوو، کە ببنە سومبلی خەبات، خاڵی پڕشنگدارە، بەرهەمداری کوردایەتی، گەرچی مەلای کۆیە بەپێی مەوقفی تێکەڵاوی لەگەڵ حکوومەتی شێخ مەحموود دیار نییە، بەڵام پرسیاری ناوێ، کاریگەری هەیە لەسەر هزرو هەڵوێستی.
قۆناغی نوێی کوردایەتی، پەیدابوونی خەباتی حیزبایەتی کۆیە، بێشکەی ئەم هەوڵانە بوو (خۆیبوون) لقی هەیە لە کۆیە حیزبی ئازادی، هاتنی مامۆستایانی سلێمانی بۆ ئێرە، دروستبوونی فەزای نەتەوەیی شنە شەماڵێکی فێنکە، دەروونی جوامێرانی ئەم شارەی گرتووە، سەرقافڵەیان مەلای گەورە بوو، هەرچەند مەلا نەچۆتە ناو حیزبایەتی. جارێکی تریش دەڵێم شەڕی جیهانی لە کوردستانیش (بەشی ئێستای عێراق) بووە، مەیدانی ئاگرەکەی هەموو شتی لە هەموو دنیا گۆڕینی واقیعی نوێی فەرز کرد، هەوڵەکانی کورد لە سێڤەر مەسەلەی ولایەتی موسڵ، دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، لکاندنی کوردستانی خواروو بەو دەوڵەتە، مەرگەساتەکانی شەڕ، گرانی، ڕشانەوە، فەوتانی لاوان، پاڵەپەستۆیان کردۆتە سەر بیرو هۆشی هەموو خەڵك، جا چ جای زانا و بلیمەتەکانی وەك مەلای گەورە، دیارە ئەم زانا زیرەك و هەست ناسك و تێگەیشتووانە، لە هەموو کەس زیاتر بیری تیژیان بەکارهێناوە بۆ حاڵیبوون لەو وەزعە نوێیە، ئەگەر لە هەڵوێست و ڕەفتاری مەلا وردبینەوە چاك بە چاوێکی واقیعییانە، سەیری ئەم حاڵەتە دروست بووە و نوێیە کردووە ڕەسمی هونەری خۆی کردووە، بەڵام بە (فن ممکن) ئیشی کردووە و تموحی لەبیر نەچووە.
ئەم هەموو کەشمەکەش هەڵلاو هەرای پێش جەنگ و دوای جەنگ، ئەو گۆڕان و پێشکەوتنانەی بەسەر کوردەواری و کوردایەتی دا هاتن، بڵاوبوونەوەی ڕۆشەنبیری نەتەوەیی لە دەرچووی ڕۆژنامەی کوردستانەوە تا ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەستەنبووڵ و سلێمانی و شام و ڕەواندز... هتد.
مەلای گەورە لە ڕوانگەی ڕادەی زانستی و پایەی بنەماڵەکەیانەوە، پەیوەندییەکی زۆر لەگەڵ ئەم دونیای ئەو ڕۆژگارەدا هەبووە.. خۆشی دەوری تێدا بینیوە لە ئیدارە و سیاسەت، جگە لە بنەماڵەکەیان، پشتاو پشت خەریکبوون بە مەعریفە و زانست... باوکی حاجی مەلا عەبدوڵلا جەلی، عەلامە و زانای سەردەمی خۆی.. خاوەن کتێبخانە و نووسین، سەرچاوەی زانیاری بوو.. مەولودنامەی بە کوردی نوسیووە.. دۆستی حاجی قادرو شێخ ڕەزا و ئەختەر و کەیفی دەیان شاعیر و زانا و بیرمەندی کورد بوو... پیاوێکی خۆڕاگر بووە... شێخ ڕەزا دەفەرمووێ:

**حاجی کاك ئەولا لە ئادەم فێلترە**
**با وجودی مەرتەبی پێغەمبەری**
**ئەم بە سەد شەیتان لە کۆیە دەرنەچوو**
**ئەو بە شەیتانی لە چەند دەرپەڕی**

یان دەڵێت:

**لەبیرت دێ چوینە باڵەك**
**نە کەوشم و نە کاڵەك**

**جا وەك شێخ ڕەزا بۆ باپیرانەی خۆی دەڵێ، لەسەر جەلی زادانیش دەگونجێ..**
**بەڵێ بابی وها ئەبێ فرزەندی وابینێ**
**ئیلاهی سەد هەزار ڕەحمەت لە قەبری والید و مەولود.**

جا ئەم قۆناغەی مەلای تێدا پێشکەوتووە.. ئەم ئاو و هەوای کوردەواری سەردەمی پێش خۆی و خۆی کاری تێکردووە ئەویش کاری لەسەر کردووە.
بە کورتی ئەم هۆکارانەی باسمان کردن لە سەردەمی مەلا دا، لە کوردایەتی چووە قۆناغێکی تر، چ لە ڕووی بڵاوبوونەوەی بیرو باوەڕەکە، چ لە ڕووداوەکان.. با بزانین جەنابی مەلا چۆن ئاوێتەی کوردایەتی بووە، چی کردووە لە شیعرەکانی، لە ڕەفتار چی دیارە بۆ سەلماندانی هەڵوێست و بیری نەتەوەیی ئەو.
جا با هەندێ نموونە و کردار بهێنینەوە لە باسەکەماندا.. پێموایە ئەم تەفسیری قورئانەی بە کوردی، گەورەترین خزمەتی موسوڵمانە کوردەکانی کردووە، کوردیش قورئانی لێکداوەتەوە بە زمانی کوردی، حاجی دەڵێ:
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری.
مەلا ئەم کارەی دا دەچێتە ڕیزی ئەو زانایە موسوڵمانە کوردانەی خزمەتی ئایینی ئیسلامیان کردووە.. ئەتوانین لەناو دنیای موسوڵمانان شانازی پێوە بکەین.
ئیمامی غەزالی دەڵێ.. ئیسلامەتی لەسەر سێ تیرەگە ڕاوەستاوە، ئەگەر ئەمانە نەبان، لەوانەبوو بتەپێ، (دینەوەری، ئامێدی، شارەزووری). دوای تر بیتووشی، ئیبن خەلەکان، ئیبن ئەسیر، ئیبن سەلام... هتد.
جەنابی مەلا ئەوەندە قازی بووە لە کۆیە، وابزانم تا ١٩٢٨ مرافەعەی بە کوردی بووە، ئێستاش ماون، هەرچەندە یاسای زمانەوانی محەلی هەبووە، بەڵام کەسی تر جێبەجێی نەکردووە وەك مەلای ئێمە، کە مەلا ئەمری خوا دەکات، کۆمەڵەی (ژ. ك) لە مەهاباد پرسەی بۆ دادەنێن، ئەمەش دەلیلە لەسەر مەزنیی جەنابی مەلا لە کوردەواری بۆ کوردایەتی، هەموو شیعرەکانی کە لەسەر کوردەواری و کوردایەتی بوون، لە ڕۆژنامەکانی مەهەباد (ژ. ك) بڵاو کراونەتەوە لەتەك شیعرەکانی حاجی قادر.
یان لێی دەگێڕنەوە کە ئەندام مەجلیسی تآسیسی عێراق بوو، هەرایەك قەوماوە، خەڵك پەلاماری مەجلیسیان داوە، هەموو ئەندامەکان هەڵاتوون تەنها مەلا ماوەتەوە، کە گەڕاونەتەوە سەرۆکی مەجلیس لێی پرسی: تۆ بۆ هەڵنەهاتی؟ وتی من شەرمم لە خۆم کرد، هەم موسوڵمانم و مەلا و کوردم، ئەمەش ئعتزازە بە گەورەیی قەومەکەی.
دوای ئەم هەموو هێنان و بردنەوە ڕەسم کردنی چوارچێوەی ژیانی مەلای گەورە، لەگەڵ ئەوەی هەندێ نموونەمان هێنایەوە، گەر زیاتر ڕاستەوخۆ تر بچینە ناو باسەکە کە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەمان لەدەوری مەلای گەورە لە کوردایەتیدا و سیاسەتی ئەوێ ڕۆژێ کوردەواری و کۆیە، پێم باشە بۆ ئەوەی زوڵم لە مێژووی ئەو پیاوە نەکەین، غەدریش لە حەقیقەتی مێژوویی نەکەین وەك خۆی هەڵبسەنگێنین:
مەلا محەمەد جەلی زادە، مەلایەك بووە زۆر زیرەك و زاناو دانا، چوست و چالاك لە ژیانی دا، بە هەڵوێست، ئازا، بەڵام نە خاوەنی عەشیرەت و خێڵ بوو، بەڵکو بنەماڵەیەك لە کۆیە شیواشان، نە شێخێکی تەریقەت کە سەدان مرید و دەروێشی لە دواوە بێ، خۆی دژی هەڵوێستی ئەم شێخایەتییانە بووە، لە شاریکی بچووکی لاپەری، بەڵام دێرین کە زەمانە هارپوویەتی، کاول و خاپووری ئەم کوردستانەدا ژیاوە، لەوەش خۆشی خاوەن بڕی ملك بەرژەوەند بووە، ئەمەش دوو لایەنی سەلبی و ئیجابی بووە، لە لایەك بەهۆی ئەم موڵك و ماڵەوە سەربەخۆ بووە، پێویستی بە زەکات و سەرفگرە نەبووە، لە لایەکی تر کاری کردۆتە سەر هەڵوێست، بڵێین و نەڵێین بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەوەی من تێبینی دەکەم، چ بیستوومە، یا خوێندوومەتەوە لەسەر ڕەفتارو هەڵوێستی ئەم پیاوە کە زانایەکی دینی گەورە بوو، وا دەبینم بە زیرەکی خۆی، بە هزری کراوە و بیری تیژی واقیعبینانە، دەورەکەی خوێندۆتەوە، مامەڵەتی لەگەڵ کردوو چەند لە هەڵوێستەکانی دا دیاری دەکەین.
جا هەر بۆیە زانایەکی موسوڵمانی گەورە لەسەردەمەکەی خۆیدا گرنگی هەبوو، دیارە مێژووی کورد و موسڵمانیەتی، چەندین سەدە تێکەڵاویی بە چاك و خراپە لێ پەیدا بووە، وەك لەسەرەوەش هێمامان پێ کرد لەناو کوردی موسڵمان زانای گەورە هەبوون، کە ئێستا کورد دەتوانێ لەناو هاوئاینەکانی شانازی و منەتیان پێ بکات، جارێکی تر ناوەکان وەك: دینەوەری، ئامێدی، شارەزووری، بێتووشی، مەلا لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانە دەژمێردرێ بە عەقڵێکی کراوە و فراوانی عەسری خۆی.
لەگەڵ زانستی نوێ، سیفەتی تازە و دنیای پێشکەوتوو گونجاو دژی خورافیات، ئەو ژەنگەی بەسەر دیندا هاتووە، داوای زانست و تەکنەلۆجیای نوێ دەکات، هانی خوێندنی زانستەکان دەدات و کچی خۆی لەگەڵ کوڕان دەنێرێتە مەکتەب، ڕەنگە ئەم حاڵەتە زۆر نادر بێت لە ڕۆژهەڵات لەو سەردەمە. حەزو هزری

كوردایەتی لای مەلای گەورە چەند دەلیل و نیشانەی هەن، تەفسیری کوردی مورافەعەی دادگا بە کوردی وەك باسمان کرد، ئەوە زیاتریش لە وتار و شیعرەکانیدا وەك داعیەکی نەتەوایەتی دەرکەوتووە کە دواتر نموونەی لەسەر دەهێنین، هاوتەریب لەگەڵ گەشەکردنی گیانی کوردایەتی وەك داواکار و پێشەوایەکی ئەم ڕێبازە ڕێگەی کردووە. جا لەگەڵ ئەو هەموو ستایش و پێهەڵاگوتنە، بەڵام بۆ ئەوەی ڕاستی ون نەکەین و بەپێی توانای خۆی هەوڵەکانی بقەبڵێنین، ناکرێ وەك سەرکردەیەکی سیاسی ناسیۆنالیستی ناوزەدی بکەین، بەڵکو مەلایەکی نیشتمانپەروەر، بۆ میللەتە مەزڵومەکەی و بیری نەتەوایەتی خۆشەویستی کوردەواری هەستی کرد بوو، وە کاری لەسەر دەکرد لەم کەلێنەی بۆی دەلوا، بۆ نموونە ئەندامی ئەنجوومەنی ویلایەتی موسڵ بووە، هەوڵی داوە خوێندنگەیەك لە کۆیە بکرێتەوە، جەنابی مەلا خەمی کۆیەی بووە وەك نیشتمانە بچکۆلەکەی هەلی فرسەتێکی هاتیی هەوڵی داوە، بە شیعریش دەڵێت:

**هەستە پێشکەوە ئەی لاوی کۆیی**
**ئاگات لەخۆبێ کاروان ڕۆیی**
**بە نووری عیلم ڕێگا بەدەرخە**
**بەزۆری بازوو بارێ وەسەرخە**
**لە شیعرێکی تریشدا دەڵێ:**
**ئەوەندەم لا عەزیزە شاری کۆیە**
**بە دوڕو لەعلی نادەم ورتکە بەردی**
**لە دونیادا چەند خۆشە شارە ناگاتە کۆیە**
**بە ڕووبار و دەشت و کێوو گردی**

هەردەم بەرگری لە مەسەلەی نەتەوەکەی کردووە جەنابی، ئەگێڕنەوە جارێك دوو ئینگلیز میوانی جەمیل ئاغا دەبن، مەلاش حازر دەبێ، تانە لە شێخ مەحموود دەدەن کە ئاژاوە دەنێتەوە، لێیان وەجواب دێت و دەڵێ: ئەگەر شێخ مەحموود بەشێکی وڵاتی بەریتانیای داگیر بکردبا، ئێوە چیتان دەکرد بەرامبەر؟ دەڵێن: بەگژدا دەچووین، دەڵێ شێخیش وا دەکات، ئێوە وڵاتی ئەوتان داگیر کردووە، شەڕ دەکات بۆ ڕزگاری، ئەوە دەسەلمێنێ جەنابی مەلا باوەڕی قووڵیی بە مەسەلەی میللەتەکەی هەیە و ئازایانە بەرگری لێدەکات، ئەگەر بێینە سەر شیعرەکانی ئەزانین بە هەناسەی قووڵ و پەرۆشییەکی لە دڵی هەرکروزاوەوە دەڵێ:
هەتا دەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم

یا دەڵێت:

**من یەخەی خۆم لەبۆیە دادەدڕم**
**ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم**
**دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ**
**قەومی من وا ڕەزیل و ڕیسوا بێ**
**ئەوەی ڕێگەی لە کوردان گۆڕی**
**لەعنەتی خوا لە ئەلحەد و گۆڕی**
**گەر هەواڵی کورد و کوردستان دەپرسی**
**وڵاتی چۆڵ و قەومی ڕووت و برسی**
**عەرەب و تورك دەوڵەتی ئێران**
**دابەشیان کردووە وڵاتی کوردان**

بەشێکی تر لە شیعرە کۆمەڵایەتییەکانی دووبارە دژایەتی خورافیات و دەجالی بەناوی دین و شێخایەتی و چەوساندنەوەی خەڵکی هەژارو نەخوێندەوار بووە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەتوان و دەرمانی دەردە

کۆمەڵایەتیەکان و ئاراستەی بەرەو پێش چوونی کۆمەڵە، لامwaیە ناراستەوخۆ ئەمیش هەر کوردایەتی و خزمەتی کوردەوارییە.
گەر لەسەر هەموو لایەنی شیعرەکانی بڕۆین، دیارە ئەوە باسێکی تایبەتی دەوێ، پسپۆڕی ئەم بارەی لازمە، بەڵام بۆ بەهێزکردنی باس و بۆچوونەکەمان لەپێشەوە پەنجەمان بۆ ڕاکێشا:
کاریگەری شیعریی و هزری حاجی قادر لەسەر شیعر و ڕەفتاری مەلای گەورە، کە حاجی ڕابەری بیری نەتەوایەتی و مەلاش شوێن هەڵگری بووە، وەك حاجی دەفەرمووێ:

**جۆشێك بدەن وەکو هەنگ**
**تەکبیرێ بکەن بەبێ دەنگ**
**ئەسبابی شەڕ پەیداکەن**
**تۆپ و تفەنگ و هاوەن**

مەلای گەورەش دەفەرمووێ:

**وەکو شێر وەرنە مەیدانی جەرائەت**
**بە غیرەت بن بە غیرەت بن بە غیرەت**
**تفەنگ و تۆپ و تەیارە پەیداکەن**
**بە عیزییی دین و دونیا ڕوو لە خوا کەن**

دەلیل زۆرن گەرچی پێویست ناکات کە گیانی کوردایەتی مەلای گەورە دەسەلمێنن.
دەبینین ئەو هەستە پاکە کورد پەروەرییە، بەناو کوڕ و کچەکانی بنەماڵەکەیدا هاتۆتە خوارێ، لە ئیلهامی هیزری ئەو هەموویان لەگەڵ کوردایەتی بوون. دەبینین حیزبێکی کوردستانی وەك (ژ. ك) لە مەهاباد بۆ مردنی جەنابی مەلا پرسە دەگرن، لەو دیو کەوشەنی وڵاتی عێراقەوەن، دیارە هەر کوردایەتی جەنابی مەلا کە لەودیویش ئەم نرخ و ڕێز و پایە لێنانەی هەیە.
وتارێکی جەنابی مەلا لەسەر نەورۆز لەساڵی ١٩٣٨ لە بەردەرکی سەرا خوێندۆتەوە.
کە ئەوسا زۆر پیاوە ئایینیەکان و خەڵکی سادە، وا قەناعەتیان پێکرا بوو کە نەورۆز یادی ئاگر پەرستە، دیارە ئەو بە قووڵیی لە مەسەلەکە گەیشتووە بۆ زیندووبوونەوەی گیانی کوردایەتی بەکاری هێناوە کە دەڵێت:
**(ئیمرۆ ڕۆژێکە پڕ نوور، دونیا ماڵە و ماڵ سروور، ژاڵە دەدرەوشێتەوە، لالە دەگەشێتەوە، دار و درەخت دەپشکوون بەڕوو و سەمەر دەردەکەون، فەلەك وەك زبر جەدی هەڵدراوە، زەمین کەوای ئەتڵەسی سەبزی گوڵ گوڵاوی لەبەرکرا، ئافتابی عالەم درەخشانە، تا دەگاتە بەڵێ بەڵێ ئەمڕۆ ڕۆژی مورادە، نەورۆزی گەلە حەقە زۆر موبارەکە، ئەوەڵی بەهارە، یەك ئیعتیدالی لەیل و نەهارە، جەژنە جەژنی ئومەتە، مەحەبەت و ئولفەتە).**

هەروەها کاریگەری هێزر و کوردپەروەری جەنابی مەلا، لەناو ئەو فەقێ و مەلایانەش ڕەنگی داوەتەوە کە لای ئەو خوێندویانە، یا ئیجازەیان وەرگرتووە.
لە باسەکەمان پەنجەمان بۆ ئەوە ڕاکێشا لە ڕووی پراکتیکییەوە لە ڕەفتاری جەنابی مەلا وەك هۆشمەندێك بە فەنی مومکین ئیشی کردووە، بەڵام هەرگیز ئاواتە دوورەکانیشی لەبیر نەکردووە، دیارە هەڵوێست لەو کاتەدا هەستیارە کە شەڕی یەکەم کۆتایی هات و عوسمانی شکاو ئینگلیز هاتە ناو عێراق و کوردستانەوە. وەکو بیستومانە و خوێندوشمانەتەوە، لە کۆیە لەو ڕۆژگارەدا ٣ تەوژم (تیار) هەبووە، یەکەم تەیاری تورك چییەتی، دیارە دەوڵەتێك نزیکەی ٤٠٠ ساڵ حکومڕانی بکات، دیارە خەڵکی دەبێت ئەمانە حەزیان دەکردو پشتیوانی ئەوە بوون حکومەتی عوسمانی، یان تورکی، بگەڕێتەوە کە لەشکرە شەق و شڕەکەی بۆ ناوچەی ڕەواندوز گەڕاندەوە، هەندێ سەرباز و ئەفسەریش هاتوونەتە کۆیێ بەهاوکاری دۆستەکانیان هەر لەسەر ئەوەش کۆیە بۆردومان کراوە لە لایەن ئینگلیزەوە، جەنابی مەلا دژی ئەم هەڵوێستە بووە، هەموو حوکمێکی پێ لە هی تورکان باشتر بووە، ئەو چەند ڕۆژەی ئەو تورکانە لە کۆیە بوون، ئەو باری کردووە بەماڵەوە چۆتە پێبازۆك، دیارە ئەمانە زەرەریان لە کۆیە داوە.
تەوژم (تیار)ی دووەم، کۆمەڵێك لەو کۆییانەی لە ڕووسیا دیل بوون، دوای شۆڕشی بەلشەفی ئازاد کراون، دیارە هەندێ بیرو باوەڕی ئازادی دژی ئیستعیماریان فێر کردوون، گەرچی گیانێکی شۆڕشگێڕی پاکیان هەبووە، بەڵام نا واقیعی و عاتفیانە، بێ بوونی مقەوەمات و ئەسبابی خۆڕاگری، پەلاماری قشڵەیان داوە و ئینگلیزیان دەرکردووە، دواتر ئینگلیز کە گەڕاوەتەوە، ئەوەش خراپ لەسەر کۆیە شکاوەتەوە، نەخوێندنەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لەو سەردەمدا لە وەزعەکە حاڵی نەبوون هەر ئەم دوو ڕوداوەش وای کرد کۆیە هەر بە قەزا بمێنێتەوە، ئەویش بێتە شاری ئۆپۆزسیۆن.
تەیاری سێیەم کە لە پیاو ماقووڵ و ڕیش سپی و دەسەڵاتدارەکانی ئەوسای شار کە دەوریان بینیوە، لەگەڵ واقیعی نوێ گونجاون، حەمە ئاغا و جەمیل ئاغا و جەنابی مەلای گەورە خۆی نواندووە، ڕەنگە خوێن گەرمێك لە دڵسۆزی خۆی ڕاست بێتەوە ئەم هەڵوێستە بە خراپ لێك بداتەوە. دیارە بەڵگە نەویستە هەموو کار و هەواڵێك لە پێناو ئازادیدا بدرێت چاکە و مەردانەیە، بەڵام لەگەڵ واقیع بگونجێت، سەرەنجامی خراپ و نێگەتیڤی لێنەکەوێتەوە، دیارە ئەوە بۆتە مێژوو و تێپەڕیوە، ڕەنگە هەر کەس بە شێوەیەك لێکی بداتەوە. مەسەلەکەی بەلای ئێمەوە دەوری مەلای گەورە لە کۆمەڵی کۆیە و کوردەواری، نەك بۆ عوزر هێنانەوە بۆ هەڵوێستی وەك

لەسەرەوە باسم کرد، نە غەدر لە جەنابی مەلا بکەین، نە لە حەقیقەتی وەزعەکە، بەپێی هەموو باس و خواستەکانی ئەو زەمانی دوای شەڕ، وڵاتەکە، میللەتەکە دارزا بوو، مەناعەو مقاوەمەتی زۆر کەم بوو لە مامۆستا مەلا سدیقی تەق تەق و مامۆستا مەلا قادرکانی دەربەندیم بیستووە، کە ئینگلیز فەقیر خانەیان کردووە.
خواردنیان ئەدا بە هەژاران.. خام و جاویان هێنا بۆ جل و بەرگی نەداران، ئەگینا خەڵکەکە زیاتر بە قڕان دەچوو وەك لە گرانیەو ڕشانەوەکە بیستمان چییان بەسەر هات.. هەروەها میستەر های جێگری حاکمی ئینگلیز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە.. (من حاڵەتێکی ئەوهام دیت).
دەربارەی بوونی حکومەتی شێخ مەحموودیش، دیارە چ لەو جارە تورك کشانەوە وڵاتی سلێمانییان دایە شێخ وەك حوکمدار، چ کە ئینگلیزی هێنایانەوە وەك مەلیك سنورەکەیان لە وڵاتی سلێمانی بۆ دانا.. ئینگلیز ڕاستی لە کۆیە بەولاوە ویستیان یەکەمجار خۆیان حوکم بکەن، کە حکومەتی عێراقیان دامەزراند ولایەتی موسڵ بە کۆیەوە بەم حکومەتەیان لکاند.. دیارە باسێکی مێژوویی زۆر هەیە لەسەر ئەو وەزعە کە شێخ مەحموود شێخ عوسمانی سەرگەڵوی ناردە کۆیە.. ئینگلیزەکان بە فرت و فێڵ ناردیانەوە سلێمانی.. حەمە ئاغای گەورەیان کردە حاکمی شار، بە کورتی ئینگلیزی دەسەلاتداری کۆیەی نەدەدا بە شێخ، دیارە هەرای زێباریەکانیش هەر لەناوچەکەی خۆیانبوو.. جا هەر چەند دوایی بۆیان دەرکەوت هەر ئومێدێکیشیان بە ئینگلز نەبووە، بەڵام سیاسەتی ئەمرۆ واقیع مومکینیان بەکارهێناوە، دەنا جەنابی مەلا دەڵێ:

**سوورە موو زەردی چاو شین، نەکەی بە ئومێدبی ئەوەڵ بە غیرەتی خۆت، دووەم بە عەونی ڕەبی**

جا لەڕاستیدا جەنابی مەلا بە قەناعەت دژی دەوڵەتی تورك بوو، پێی وابوو ئەو مەرگەساتە بەسەر کوردان هاتووە لەمەڕ وانە، هەرواش بوو، تاکە ئیتیحادو تەرەقیش ئینقیلابیان کرد تۆرانیەتێکی شۆڤینیستانە ڕەفتاری کرد.. جمهورییەتی تورکیش هەروەها بوو، لە هەموو ئەو وڵاتە، کوردی بەسەردا بەش کرا.. دڕندانەتر کەوتنە گیانی کوردو توانەوەی.
لە لایەکی تریشەوە مەلا وشیار بوو کە تورك شەڕی دۆڕاندووە ئینگلیز سەرکەوتوو وە گەییوەتە وڵاتی، ئیتر خۆبەستنەوە بە ئەسپی دۆڕاوە (ئەوسا ڕۆژ لەسەر عەلەمی ئینگلیز ئاوا نەدەبوو).
بۆ سەلماندنی دژایەتی مەلا بۆ تورك کە هاتنەوە چەند ئەفسەر و سەربازی تورك بۆ کۆیە لە ساڵی ١٩٢٢ جەنابی مەلا باری کرد بەماڵەوە چووە گوندی پیبازۆك، وەك ئێستا دەڵێ مەلا جیاواز بووە، زانایەکی موسوڵمانی لەگەڵ دەوڵەتی بەناو ئیسلام نەبێت ئەم سێ پیاوە (حەمە ئاغا و جەمیل ئاغا و مەلا محەمەد) توانییان دەسەلاتێکی محەلی لە خەڵکی شارەکە لەژێر سایەی ئینگلیز دروست بکەن، لەوەش زیاتر نە مومکین بوو، نە لە توانای ئەواندا بوو.
دواتر کە حکومەتی عێراقی دروست بوو، مەجال نەما لەگەڵ تورکیا دەبێ یا عێراق.. مەلا عێراقی پێ چاکتر بوو.
هەڵوێستێکی تری مەلای گەورە ئەوەیە لەگەڵ جەمیل ئاغا یاداشتیان داوەتە ئینگلیز، کە حکومەتێکی کوردی بە سەرۆکاتەتی حەمدی بەگی بابان دابمەزرێنن.. دیارە ئەوەش نەیخوارد سیاسەتی ئینگلیز بە تایبەتی (کورنالیس کوکس) ئەوە بوو عێراقی پارچە پارچەیان بەیەکەوە لکان، پێیان وابوو بۆیان وا چاکە، دایانە ئەمیر فەیسەڵ.
دیاردەی مەلای گەورە بوو بووە شانازییەك بۆ کۆیە لەناو عێراق و کوردستاندا، کە حکومەتی بۆ ئەو مس بیل حیسابی بۆ دەکرا، دەیان خوێندکاری ئایینیی (فەقێ) ڕوویان لە کۆیە دەکرد.
بە کورتی مەلا محەمەدی جەلی زادە.. ناسراو بە مەلای گەورە، لەبەر گەورەیی و کەسایەتی پیاوێکی ناوداری ئایینیی و کۆمەڵایەتی و سیاسی شاری کۆیە و کوردستان بووە، ئێستا هەروا حیسابی بۆ دەکرێ.. مەلایەکی زاناو دانا و ئازا.. مەردێکی زەریفی سەردەمی خۆی، داواکارێکی بەتوانای کوردایەتی بە شیعر و گفتار و ڕەفتار، بە چاوێکی واقیعی دڵسۆزێکی نەسرەوتووی نوێخواز و سەردەم دۆست و عەقڵ فراوان و بیر تیژ، لە خزمەتی کوردەواریدا، ئێستا وتە بەنرخ و پڕ لۆجیك بەتۆی کڵ بەماناکانی لە مزگەوتەکانی کۆیە و کوردستان دەنگ دەدەنەوە و دەکرێنە بەڵگە سەلماندن و قەناعەت پێکردنی خەڵك بۆ ڕێی ڕاست.
هەوڵی زۆری داوە، بەڵام عەقلمەندی بە فەنی مومکین کاری کردووە، بۆ کوردانیش هاوار و ناڵە و فیغانی بووە، هزری حاجی بەنەوە نوێیەکان گەیاندووە، بە جۆش و خرۆشی خستوون، ئەو ڕێبازە لە کۆیە نەپسایەوە، چەندین تێکۆشەر و مەرد و مەزنی نیشتمانپەروەری کوردایەتی لێ هەڵکەوتن، سەروی هەمـــوشیان جەنابی مام جەلال.

مەلا تا توانی دریغی نەکرد
هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی

## دەسپێك

سەرەڕای ئەوەی لەئاست گەلانی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، مێژووی شیعر و ئەدەبیاتی کورد کورت و ئالۆز و نادیارە، بەلام لەهەمان کاتدا مێژوویەکی مەزن و پرشنگدار و کولتوورێکی ڕەسەن و خاوەن شێوە و ناوەڕۆکی تایبەتە، فاکتەرە سیاسییەکان لە پێشەوەی ئەو فاکتەرانەن کەوا بوونەتە ڕێگر لە گەشەکردنی هزر و عەقلی کورد و چەقبەستنی ئەدەبی کوردی لە خالێکی دیاریکراودا، مێژووی کورد ئەوەندەی مێژووی جەنگ و ڕاپەڕین شۆڕش و چەك و چیا و خوێن و مەرگ بووە، چارەگێك بەقەد ئەوەندە مێژووی زانست و ئەدەبیات و مەعریفە نەبووە، گەلی چەوساوە و ژێر دەست، ئەوەندەی بە دوای هەلمژینی هەناسەیەکی ئازاددا دەگەڕێت، ئەوەندە بەلای شیعر و کتێب و ئەدەب و مەعریفەدا ناگەڕێت، سەرەڕای ئەوەش ئێمە هەردوولامان بەدەستەوە گرتووە، مێژووی شۆڕش و ڕاپەڕین لەپێناو ئازادیدا، مێژووی شیعر و ئەدەبیات لەپێناو ڕازاندنەوە و جوانکردن و ئارایشتکردنی ژیاندا، لەیەکتر دابڕاندنی کورد و شیعر کارێکی ئەستەمە. مرۆڤی کورد بە شیعر دلشاد دەبێت و بە شیعریش غەمبار دەبێت، لەپرسە و ماتەمیشدا بەدەم گریانەوە شیعر دەلێن... هەر پیرەمێردێك، یان پیرەژنێکی کورد ببینی، بە دەیان پارچە شیعری لەبەرە، چونکە شیعر لەسەردەمانێکی زووەوە خۆراکی دەرونی کورد بووە، بۆیە لەنێو شاعیراندا چەندین شێخ و سەید و مەلاش ناویان دەرکرووە. ئەگەر ڕەخنەگران و بیرمەندان ئەدەب بەسەر چەندین ڕەگەزدا دابەش دەکەن، ئەوا دیارە شیعر بۆ خۆی ژانرێکی ئەدەبیی سەربەخۆیە، ئەگەر چی ئێستا چەمکی ژانری ئەدەبیی و مردنی ژانرەکان قسە و باسی زۆری لەسەرە، بەتایبەتیش لەنێو کولتووری خۆرئاوادا، بەلام لای ئێمە جارێ ئەم باسە لە گۆڕێدا نییە.
لەنێو خودی شیعریشدا ئەوا شیعر بەسەر چەندین جۆردا دابەش دەکرێت وەك (شیعری سۆزداری، سیاسی، کۆمەلایەتی، زانستی... تاد). لەم باسەدا هەولٚ دەدەین چەمکی زانست لەنێو شیعرەکانی (مەلای گەورە) دا بدۆزینەوە و ڕاڤەیان بکەین و ڕۆشنایان بخەینە سەر و دەرگا کلۆم دراوەکانی نێو شیعر بخەینە سەر پشت. ئەگەر دەرگاکانیش نەکرێنەوە، شیعرەکان خۆیان بە دەستەوە نادەن، خۆبەدەستەوەنەدانی شیعریش ڕاگەیاندنی ئیفلاسبوونی ڕەخنەگر و لێکۆلەرەوەیە، بۆ ئەوەی ئێمەش ئیفلاسبوونی خۆمان ڕانەگەیەنین، ئەوا دەرگا و پەنجەرە داخراوەکانی نێو شیعر تێکدەشکێنین و شیعر دەخەینە ژێر ڕەحمەتی تەئویل و ڕاڤەکردنی خۆمان.
(مەلای گەورە) مەلا محەمەدی حاجی مەلا عەبدوللا. ئەگەر لە زۆر شوێنی کوردستان بپرسی ئەم زاتە کێیە؟ زۆربەی هەرە زۆری خەلك نایناسن، بەلام کە وتت (مەلای گەورە) ئیتر ئەوە هەر خۆیەتی کەسی تر ئەم ناوەی لێ نەنراوە و بۆ نەماوەتەوە جگە لە مەلا محەمەدی جەلی زادەی کۆیی نەبێ. ئەم ناوەش بە فەرمانی سولتانی نەبووە، خۆشی خاوەنی دەسەلات و خێلی مەزن و بەهێز نەبووە تا لەترسان بەم ناوە بانگ بکرێت و ناوی بهێنرێت، بەلکو مەلا و خوێندەوار و خەلکی کوردستان بەم شێوەیە ناویان هێناوە، ئەوەش پلە و پایەی کەسایەتی زانستی ئەم زانایە دەردەخات(١) مەلای گەورە لە بنەمالەیەکی زانیاری و زانستی بووە کە بە درێژای(٣٠) سالٚ خەریکی بلاوکردنەوەی خوێندەوارین لەکوردستاندا، ئەوەتا (حاجی قادری کۆیی لەنامەیەکدا بۆ باوکی مەلای گەورە دەنووسێت:

**بە غەیری جەددی ئێوە کێیە دانا**
**لە کوردستان بناغەی عیلمی دانا(٢)**

مەلای گەورە زۆر شەیدای زانست و مەعریفە بووە و لە دوای خۆیدا(١٤) کتێبی بە زمانی عەرەبی و(٥) کتێبی بە زمانی کوردی جێهێشتووە(٣) لەپالٚ وتار و نووسیندا، مەلای گەورە لەبەر ئەوەی شارەزای زمان بووە بۆیە زۆر شیعری جوانی داهێناوە و زۆربەی زۆری شیعرەکانیشی هانی مرۆڤی کورد دەدات تا چیتر لە بەردەم ڕۆژگاردا دەستەوەستان نەوەستێت و ببێتە خاوەنی زانست و مەعریفەی تایبەت بەخۆی و لەم سادەیی و گەمژەییە ڕزگاری بێت، لێرەش لەم باسەدا وەك لە سەرەتادا ئاماژەمان بۆ کرد، جەخت دەکەینە سەر لایەنە زانستییەکان لەشیعرەکانی مەلای گەورەدا.

## پێگەی زانست لای مەلای گەورە

سەرەتا بەر لەوەی دەست بە ڕاڤەکردنی شیعرەکان بکەین، بە تایبەتیش ئەوانەی لایەنی زانستیان بە خۆیانەوە گرتووە، دەبێ بزانین زانست وەك چەمکێکی فرە بایەخ و فرە لایەن چ جۆرە ئامادەبوونێکی هەیە، خودی چەمکی زانست ئاماژە و دەلالەت لەچی دەکات، لەبەرئەوەی دیارە لە ڕوانگەی مێژووییەوە دەکرێت هەموو داهێنانێکی نوێی مرۆڤایەتی بچێتە زانست و زانستکارییەوە، بۆیە دەستنیشانکردنی ماناو دەلالەتی چەمکی زانست پێویستە، خوێندنەوەیەکی

سەرتاپاگیرانەی شیعرەکانی(مەلای گەورە) ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کەوا خودی شاعیر زۆر جەخت لە زانستە سروشتییەکان دەکات، ئەوەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کەوا شاعیر زۆر بەهای ئەم زانستانە دەزانێت و ئاگاداری ئەوەیە کەوا سروشتزانی و پێشکەوتنە زانستیەکانی ئەم بوارە بوون ئەوروپایان کردە سەرداری جیهان. هەر بەوەندەش ناوەستێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ کیمیازانی و فیزیازانی دەکات، کەواتە سەرەڕای چەمکە گشتییەکەی زانست، بەڵام شاعیر زیاتر مەبەستی کیمیا و فیزیا و زیندەوەرزانی و ئەو زانستە مەزنانەیە کەوا داهێنانی زانستی مەزن بەدەست دەهێنن و مرۆڤ لە ملکەچی سروشت دەرباز دەکەن و بەهاو شوێنی دیاری خۆی لەنێو ئافەریدە کراوەکانی تر پێی دەدەن، ئەو کاتی جەخت لەسەر فێربوون دەکات پێی وایە دەبێ ژنیش لەم پرۆسەیە بەشداری بکات و ئەویش دوانەکەوێت، ڕاوبۆچوونەکانی سەبارەت بە ژن زۆر جوان و  پێشکەوتنخواز بووە، بەڕای مەلای گەورە تەنیا ئایین بەس نییە تا مرۆڤ خۆی لە خودی خۆی ڕازی بکات. ئەوەتا لە چاوپێکەتنێکمان لەگەڵ مامۆستا (فاروق)ی کوڕیدا دەڵێ: باوکم پێی وابووە کە «ئەدیسۆن و مەدام کۆری کەوا کارەبا و ڕادیۆمیان داهێناوە، گەورەترین خزمەتیان پێشکەش بە مرۆڤ و بەشەریەت کردووە، ئەمانە پێش سۆفیی شەمزینی بەرماڵ بەکۆڵ دەچنە بەهەشت «(٤)، کەواتە ئاوێتەکردنی زانست و ئایین وەڵامێکی سەرکوتکەر بووە بۆ ئەو کەسانەی بەناوی ئاینەوە پێشکەوتنی زانستیان ڕەتکردووەتەوە، بەم شێوەیە دەبینین چەمکی زانست فرەلایەن و فرە ڕەهەند و فرە مانایە و هەرگیز یەك مانا بەخۆیەوە ناگرێ،(مەلای گەورە) تەنیا کتێبی ئاینی نەخوێندۆتەوە، بەڵکو سەرجەم کتێبەکانی تریشی دەخوێندەوە، بۆیە جارێکیان چەند پیاوێکی گەورە لە بەغداوە هاتبوونە کۆیە بۆ سەردانی (مەلای گەورە)، کاتێك بینییان خەریکی خوێندنەوەی (حیاه نابلیون) و(سیر تطور الامم) و(العقل الباطن) ی فرۆیدی دەخوێندەوە، زۆریان لا سەیربوو، مەلای گەورەش وتویەتی (ئەگەر بەتەنیا لەبەر مەندیل بڕیار لەسەر نەخوێندەواریتی مرۆڤدا بدەن ئەوە ئێوە بە هەڵەداچوون، چونکە هونەر و زانست میراتی مرۆڤایەتییە) (٥).

بۆیە مەلای گەورە لە شیعری(من یەخەی خۆم بۆیە دائەدڕم) دا، کاتێك ئەم شیعرە لە شێوەی گوتارێك ئاراستەی گەلی کورد دەکات دەڵێت:

**جاهیل و بێ کەماڵ و شەرمی حزور**
**(ابغض) خەلقی خوا فەقیرو فەخور**
**حەیفە بۆ غیرەتی سەلاحەدین**
**ئەو کەسانە بڵێن ئەمەش کوردین**

تا دەگاتە:

**ئێوە ئەولاد و جەرگ و ناوی منن**
**ئێوە نووری گلێنەی چاوی منن**
**عومری خۆتان مەبەن بە خۆڕایی**
**تێ بکۆشن بە عیلم و ئازایی(٦)**

ئەگەر بڕوانینە ئەو دێڕە شیعرانە و بمانەوێ ڕاڤەیان بکەین، ڕاستەوخۆ وشەی (جاهیل) بە ڕوماندا دەتەقێتەوە لە بەرامبەریدا وشەی (زانا) هەیە، کاتێك ئەوانەی گوتارەکەیان ئاڕاستەکراوە جاهیل بن، واتە دوورن و بەدەرن لە زانست، ئەوە دروستکردنی هاودژییە لەنیو شیعردا، واتە نەزانین ڕاستەوخۆ دژی زانان، دیارە ئەوەی جاهیل بێت بێگومان بێکەماڵیشە، لەبەر ئەوەی یەکێك لە مەرجەکانی کامڵبوونی مرۆڤ زانابیە، مرۆڤ لە هەنگاوانیدا بەرەو کامڵبوون دەبێت بە ئاڕاستەی زانابیدا بڕوات، پێچەوانەی جەهالەت هەنگاو بنێت، لێرەدا وەرچەرخانێکی مەزن و گەورەی سەرجەم ئەو بەهایانەیە کەوا لەو سەردەمەدا باڵا دەستبوون، گوایە مرۆڤی هەژار و فەقیر خۆشەویستی خوان، ئەوە گوتاری باڵادەستی ئەو سەردەمە بووە، بۆ ئەوەی مرۆڤ بە حاڵەتی هەژاریی و نەداریی و برسیتیی ڕازی بێت و بیر لە شۆڕش و ڕاپەڕین بەسەر ئاغاو دەرەبەگ و دەسەڵاتی باڵادا نەکاتەوە، شاعیر ئەو چەمك و بەهایەی کەوا تا ئەو ڕۆژەی باڵا دەست بووە تێك دەشکێنێت و لەبری ئەو چەمکێکیتر بونیاد دەنێت ئەویش چەمکی شۆڕش و ڕاپەڕین و بەرخودانە، چەمکی هەڵگەڕانەوە و ڕازی نەبوون بە واقیع.

لە شیعری (ئاهـ و ناڵە)دا دەڵێت:

**هەتا دەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم**
**عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەحاڵم**
**بە زۆری جاهیل و نەخوێندەوارن**
**لەلای نەوعی بەشەر بێ قەدرو خوارن(٧)**

شاعیر، دان بەوەدا دەنێت کەوا تا مردنیش هەر دەبێ بنالێت، لەبەر ئەوەی زۆربەی گەل جاهیل و نەخوێندەوارن، دیارە لێرەدا ڕەشبینییەك بەدی دەکەین، ئەم ڕەشبینییە بەپێی پرۆسەی زەمەنی بێ هۆو فاکتەری ڕاست و دروست نەبوون، بگرە لەوپەڕی ڕاستیدایە. لەبەرئەوەی شاعیر دەزانێت خوێندەواری پرۆسەیەکی زەمەنی دریژی گەرەکە، بە تایبەتیش ئەگەر بوارەکانی لەبار نەبن بۆ سەرهەڵدانی ئەم پرۆسە ڕۆشەنگەرییە، دیسانەوە جەخت دەکاتەوە سەر دووریی گەلی کورد لە بواری زانست و مەعریفەدا و ئەوە ئاشکرا دەکات کەوا ئەم دواکەوتوییەی کورد لە زانست و لقە زانستییەکان، دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی چەندین داب و نەریتی ناشرین و نا شایستە، بەدەستهێنانی زانست پرۆسەیەکی دوور و درێژ و فرە لایەنە و پێویستی بە بوونیادێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی پتەو هەیە.
شاعیر زۆرجار لەنێو دەقە شیعرییەکاندا باسی (ئەربابی قەڵەم) دەکات، لێرەدا ئەربابی قەڵەم چەمکێکی کۆنی مێژووی ئیسلامە و بەو کەسانە دەوترا کەوا قەڵەم بەدەست بوون، واتە ئەو کەسانەی نووسەر و هزرڤان و بیرمەند و زانا و شاعیر بوون، لێرەدا چەمکی ئەربابی قەڵەم لەگەڵ (خوێندەوار) جیاوازە، چونکە ئەربابی قەڵەم لێپرسراویەتی زیاتریان لە ئەستۆ دایە ئەویش نووسینە، نووسین لە ڕوانگەی ئەدەبییەوە دەربڕی هزر و عەقڵ و بۆچوونی خودی نووسەرە، بەڵام قەڵەم و نووسین بە تەنیا ناتوانن پرۆسەی گۆڕانی مێژوویی ئەنجام بدەن، (مەبەستمان ئەو کات و چرکە مێژووییەیە کەوا شاعیر شیعرەکەی تیا داناوە)، بۆیە پێویست بە زەبر و هێز و بازوی چەکدار دەکات، شاعیر ئەم لایەنەش لەیاد ناکات و بایەخی تەواوی خۆی پێدەدات و جەخت دەکاتە سەر گرنگی دەسکەوتنی تفەنگ و تۆپ و تەیارە بۆ ئەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا جۆرە هاوسەنگییەك بێتەدی، تفەنگ و تۆپ و تەیارە دەرەنجامی پێشکەوتنی زانستین، بەکارهێنانیان پێویستی بە شارەزایی و پسپۆریی هەیە، کەواتە شاعیر دەیەوێ پێمان بڵێت ئەگەر لە سایەی جەنگەوەش بێت زانستمان دەسکەوێت ئەوا هەر چاك و پڕ بایەخە، کەواتە جەنگ لێرەدا لەگەڵ ئەم هەموو خراپە و ماڵوێرانییەشدا، بەڵام پێشکەوتنی زانستی بەخۆوە دەگرێت ئەوەش هەمان بۆچوونی (هیگل) بووە، کە پێی وایە لەگەڵ ئەوەی جەنگ شتێکی بەدڕەوشتانەیە، بەڵام هۆیەکە بۆ پێشکەوتنی زانستی، لە واقیعیشدا ئەمە ڕاست دەرکەوتووە لەبەرئەوەی پێشبڕکێی داهێنانی چەك لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بووە هۆی زۆر داهێنانی زانستی نوێ.
لەلایەکی تریشەوە شاعیر بۆخۆی زانایەکی چاك بووە و سەری لە زانست دەرکردووە، بۆیە زۆر جەخت دەکاتە سەر سروشتزانی زانستی کیمیا.
لە شیعری (هەستە پیشکەوە)دا دەڵێت:

**عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە**
**(قال) و (قول) گشتی هەبایە**
**عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە**
**بەخوا نازانی خوا چی کردووە**

تا دەگاتە:

**پەنیر و ژاژی شیریژ و لۆرك**
**نەتیجەی عیلمی کیمیان بەبێ شك**
**بەگلی سپی لەئاوی ترێ**
**دۆشاوی شیرین چلۆن دەکرێ(٨)**

ئەگەر چاوێك بە پێشکەوتنی زانستی ئەورووپادا بگێڕین، دەبینین سروشتزانی خاڵی دەستپێکردنی زانستی ئەورووپایە تەنانەت لە سەردەمی ڕۆشنگەری ڕێنیسانیشدا سروشتزانی سەرقافڵەی زانستەکانیتر بووە و دواتر هەموو زانستەکان لەنێو باوەشی ئەودا پەروەردە بوون، بە تایبەتیش فیزیا و کیمیا و بایلۆژیا، ئەم سێکوچکە زانستییەی کەوا شارستانییەتی ڕۆژئاوای لەسەر بنیاتنراوە، شاعیر ئاماژە بە کرداره کیمیاییەکانی هەوێنی شیر دەدات کەوا چۆن دەگۆڕێت بۆ پەنیر و ژاژی و لۆرك و ماست و...... تاد، لێرەدا دەبێت دان بەوەدا بنێین کەوا ئەو کاتە شاعیر زانیویەتی لەسایەی بەکتریاوە شیر هەوێن دەبێت و چەندین بەروبوومی لە شێوە و لەتام جیاوازی لێ سەرهەڵدەدات. دەکرا ئەم گۆڕانە کیمیاییانە بنە بناغەی کیمازانی لە نێو کۆمەڵگەی کوردستاندا، بەڵام وەك شاعیر دەڵێت: هەمووی بە قسەی پڕوپووچ لەدەست چوون، جگە لەوانەش فیزیاش وەکو زانستێکی مەزن لەپاڵ بایلۆژیادا بوونە هۆی پێشکەوتنی زانستی، تەنانەت لێکۆڵینەوە بایلۆژیەکان بوونە هۆی داهێنانی نەشتەرگەری لە شێوەی زانستی نوێدا.
شاعیر پاش داد و فیغان و گریان و هاوارێکی زۆر، لەکۆتاییدا بێ ئومێد دەبێت لەو کۆمەڵگە

کۆنەپەرستەی دەرك بە هیچ شتێك ناکات.
کۆمەڵگەیەك لەژێر نوستالیژیا (کۆنخوازی)دایە، هەرگیز نارِوانێتە پێش خۆی، بەڵکو بەردەوام ئاوڕ لە مێژووی ڕەش و خوێناوی دوای خۆی دەداتەوە، بۆیە شاعیر بە چەندین ناوو ناتۆرەوە دەیانخاتە ڕوو وەك: (فەقیر، ناتەواو، بێ پەروەر، بێ پیاوی دانا، بێ مورشید، بێ عالمی، سیاسی، بێ عەسکەری، بێ قاعیدەی ئەساسی، بێ ڕۆح، بێ حەیاتی ئیجتماعی، بێ قودرەت، بێ قووەتی دیفاعی، بێ دەفتەر، بێ کاغەز، بێ کیتاب، بێ سیفەت، بێ حیرفە، بێ کەسابەت، بێ تین، نەفام، خانەوێران، عەبدی زەلیلی شێخ و پیران)، ئەم هەموو وەسفەی کورد لە خۆڕایی نییە، ئەوەتا شاعیر خەریکە لە داخی ئەم میللەتە شەق بەرێت کە بە بەرچاویەوە نەوت لە کەرکوك دەدەین بە عارەب و ئینگلیز و فەرەنسی...، بۆ خۆشیان کورد نانێکیان نییە بیخۆن. لێرەدا دەقی شیعری دەبێتە گوتاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، خوێنەر – وەرگر لە سەرجەم مەسەلەکان ئاگادار دەکاتەوە ئەوەش فەرمانی نووسینە، درکاندنی ڕاستی، ئەو ڕاستییەی کۆمەڵانی خەڵك ئاگاداری نین پێی نازانن، ڕاستی پارچە پارچە بوونی وڵاتی کوردەواری بەسەر دەوڵەتانی زلهێزی ناوچەکە و بەتاڵان بردنی سەروەت و سامان.
بۆیە لە شیعری (هەناسەی نەوتاوی)دا دەڵێت:

**بێ دەفتەر و کاغەز و کیتابەت**
**بێ سنعەت و حیرفەو کەسابەت**
**خاکێکی هەیە وڵاتی کوردی**
**ئیکسیرە وەلێ لەچنگی مردی (٩)**

شاعیر ئەوەندە وشیار و زانایە نەوت بە (ئیکسیر) دەشوبهێنێ ئیکسیر لە فەلسەفەی یۆنانی کۆندا بنەچەی کیمیازانییەو یۆنانییەکان پێیان وابووە مادەیەك هەیە ناوی ئیکسیری ژیانە. هەر مرۆڤێك دەستی بکەوێت نامرێت، تەنانەت لەکاتی مۆمیاکردنی تەرمی مردووانیشدا ناهێڵێت تەرمی مردوو بۆگەن بێت و هەروەکو خۆی دەمایەوە بۆ ماوەی چەند سەد ساڵ. ئەم شوبهاندنە هێزی خەیاڵی شاعیر ئاشکرا دەکات لەبەرئەوەی لە ڕۆژگارێکی وەکو ئەو کاتەدا هەموو شتێك کەوا لە نەوت دروست دەکرا.
هەموو پیشەسازییەك پشتی بە نەوت دەبەست هەم بۆ وزە و هەم وەکو مادەی خام، کەواتە نەوت دەکرێ بە وتەی شاعیر ببێتە (ئیکسیر)ی ژیانەوەی کورد، بەخشینی ژیانێکی نوێ، شاعیر خەڵکیش لەوە ئاگادار دەکاتەوە کە خاکەکەیان ئەوەندە بەپیت و بەرەکەتە پڕیەتی لە کانزای وەکو زێڕ و زیو و مادەی تر، کەوا دەکرێ سوودی لێوەربگیرێ، بەڵام شاعیر ئاماژەش بەوە دەکات کەوا بۆ بەکارهێنانی نەوت پێویست دەکات کۆمەڵگە خاوەن (فیکری عەمیق و حدس و حس) بن، کە لەهەمان شیعری پێشوودا دەڵێت:

**بەو فیکری عەمیق و حدس و حسە**
**گەر ببتە شەریکی نەفع و حیسە**

تا دەگاتە:

**تا ئێوە لە حەق ئێکدی خرابن**
**بەد خواهـ و حەسوود و ناتەبابن**
**تا ئێوە لە حەق ئێکدی بە کەیدن**
**هەر لەژێر چەپەڵۆکی عەمرو زەیدن(١٠)**

دواتر شاعیر لایەنی ئایینی و مەزهەبی و عەقیدەش بەلاوە دەنێت و ڕاستەوخۆ بانگەشەی نەتەوایەتی دەکات، ئاماژە بەوە دەکات کەوا ئامادەنییە یەك بستە خاکی کوردستان بەهیچ مەرقەد و گۆڕێك بگۆڕێتەوە، جا ئەم مەرقەد و گۆڕە هەرچەندەش لەلایەی ئایینییەوە پیرۆزبێ. ئەوە لووتکەی بەرزی گیانی نەتەوایەتییە کەوا شاعیر نمایشی دەکات، بۆ ئەوەی ڕۆڵەی کورد هەڵنەخەڵەتێت و دەسبەرداری وڵاتی خۆی نەبێت...

**سەرچاوەکان:**


١- مەلای گەورە، عبدالخالق علاء الدین، کوردستان، هەولێر، ١٩٩٤. ل١
٢- دیوانی مەلای گەورە، گیو موکریانی، هەولێر، ١٩٦٩، ل١
٣- س. پ، ل٣
٤- (مامۆستا فاروق کوڕی مەلای گەورە) چاوپێکەوتن، هەولێر، گەڕەکی مامۆستایان، ٢٠٠٠/٢/١٠.
٥- مەلای گەورە، عبدالخالق علاء الدین. ل٤٩
٦- س. پ.
٧- س. پ. ل١٠١ -١٠٣
٨- س. پ. ل١١٣
٩- س. پ. ل١٣٤
١٠- س. پ

مومتاز حەیدەری

# مەلای گەورە،
# نموونەی گەورە مرۆڤێکی کوردستان

## پێشەکی:

لە ژیانی هەر کۆمەڵگەیەك/ میللەتێك، یان نەتەوەیەکی گەورە یاخود بچووك، بەپێی یاسای گۆڕانی کۆمەڵ، تاکی مرۆڤ بەگشتی، لەبەر ڕۆشنایی و کاریگەری ڕەوشی کۆمەڵایەتی، ئابووری، ڕۆشنبیری، نەتەوەییەکەیدا، لە پێشکەوتنی کۆمەڵ دەوری خۆی دەگێڕێ.. هەمان کات دەوری تاکی هەڵکەوتوو، بەپێی زاراوە و چەمکی ڕۆڵی تاك لە مێژوودا، ئەوە دەرێکی تایبەتی کاریگەر لە هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك دەگێڕێ.. لەوەش زیاتر لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکان هەڵبەت دەوری ئەو تاکە هەڵکەوتووە، لەهەر بوارێکی ژیانی مرۆڤایەتی نموونەی ئەو جۆرە مرۆڤە هەڵکەوتووانە، لە پەیامبەرەکانەوە پێغەمبەرەکان، بەسەدان ناوی درەوشاوەی گەورە هەیە، کە ڕەوتی ژیانی مرۆڤایەتییان گۆڕیوە..
هەڵبەت ئەو جۆرە گەورە مرۆیانە بە ئاسانی دروست نەبووینەو نابن، بەڵکو هەر یەکێ لەوانە، لە ئەنجامی ژمارەیەك هۆکار و فاکتەری خودی و ژینگەی مێژوویی بوونەتە پێشڕەوی کۆمەڵگەکەیان.. هتد..
دیارە، هەر چەند کۆمەڵگەیەکی لە مێژینەی دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، خوێندەواری... هتد.
وەك کۆمەڵگەی کوردستان، لە قانوونی گۆڕانی کۆمەڵ و مێژوو بەدەر نییە، بە پێچەوانەوە دەچێتە ژێر باری هەردوو جەمسەری هەڵکەوتنی کەسایەتی تاك لە پرۆسەی گشتی گۆڕانی کۆمەڵدا.. هاوکات واتە جەمسەرە نەگەتیفەکە، کە لە باوەشی کۆمەڵێکی زیدە دواکەوتوو، لەوەش خراپتر، نیشتمانی نەتەوەیی سەدان ساڵە داگیر کرابێ و سەرەڕای خەسڵەت و سروشتی سیستمی خێڵەکی و عەشایری و فشاری ئایینیی و داب و نەریتی کۆنەپەرستی، هەڵکەوتنی تاکی مێژوویی ئاسان نییە، بگرە زۆر زەحمەتیشە!! لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ژمارە هۆ و فاکتەرە دژوارانەدا، دەبینن بە درێژایی مێژووی شارستانێتی کوردستان ژمارەیەکی زۆر گەورە مرۆڤی کورد هەڵکەوتوون. هەڵبەت، هەر یەکێ لەوانە لە بواری خۆیدا، دەوری کاریگەری، بگرە مێژوویی گرنگی گێڕاوە..!! یەکێ لەو گەورە مرۆیانەی کورد، کە بەشێکی مێژووی کولتووری ڕێبازی نەتەوە پەروەری — کوردایەتی — لە سەردەمێکی تاریکی کوردستاندا، دروستی کردووە، ئەوە جەنابی مەلا محەمەدی جەلی زادەیە ناسراو بە(مەلای گەورە).

## کۆیە قوتابخانەیەکی کولتوور و کوردایەتی

لەبەر ڕۆشنایی زانستی لێکۆڵینەوەدا، واتە شیکردنەوەی هەمە لایەنی ڕەوشی کۆمەڵ: کۆمەڵایەتی، ئابووری، خوێندەواری و پەروەردە، ڕۆشنبیری، سیاسی، نەتەوەیی.. هتد، ئەوسا دەتوانرێ لە دیاردەیەك بکۆڵیرێتەوە،... دیارە دەرکەوتنی گەورە مرۆڤێك، لەهەر شوێنێ بێت، بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی — مێژوویی دەژمێررێ. واتە لە ئەنجامی هۆکار و فاکتەری کۆمەڵایەتی، لە سەردەمێکی مێژوودا، ئەو دیاردەیە دروست دەبێ.. بە واتایەکی وردتر، یەکێ لەو هۆ و فاکتەرانەی گەورە مرۆڤان دروست دەکات، خودی ژینگەیە، ژینگەی تایبەتی و گشتی — سەبارەت بە جەنابی مەلای گەورە، هەردوو ژینگە: (بنەماڵە و شاری کۆیە)، ژینگەیەکی دەوڵەمەندی (شارستانی نەتەوەیین)، هاوکات تێکڕای ژینگەی هەمەجۆری کۆمەڵگەی کوردستان، بەتایبەتی ژینگەی ژمارەیەك گەورە بنەماڵەی زانستی ئایینیی، واتە ئەو ژمارە هەرە زۆرەی مزگەوت و حوجرە و مەدرەسەی ئایینیی بەناوبانگ، لەوانەش شاری کۆیە، کە بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان — کۆن و نوێ — ئەوە دەسەلمێنن، شاری کۆیە لە پرۆسەی پێشکەوتنی کولتوور و خوێندەواریدا، (حەوزیەکی زانستی و خوێندەواری) گەورە بووە!!!.
کەواتە ژینگەی شاری کۆیە، هاوکات ژینگەی بنەماڵەکەشی بەشێکی زیندووی ئەو ژینگە پڕ بەهایەیە.. جا لەو ژینگە پڕ بەهایەی شاری کۆیە بە تایبەتی و ژینگەی هەمە جۆری کوردستان بە گشتی مەلای گەورەیان بەرهەم هێناوە.. هەڵبەت جەنابی حاجی قادری کۆیەش لەو ژینگە پڕ بەهایە نازناوی گەورە پیاوێکی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێی وەدەست هێناوە. شایانی باسە، بەداخەوە، تائیستا نە ژینگە دەوڵەمەندەکە، بگرە مێژووی سەرتاپای: (شارستانی — نەتەوەیی) شاری کۆیە و هەردوو ڕووناکبیرە ناودارەکەی سەردەمی خۆیان و ئەمڕۆ و بەیانی بە تایبەتی و تێکڕای گەورە پیاو و ژنانی، نەخوێندراوەتەوە..!!

واتە بە تەواوی لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازی: (زانستی — مێژوویی) لێکۆڵینەوە ئەنجام نەدراون..!!
هاوکات ژمارەیەك نامیلکە و کتێب و لێکۆڵینەوەی جۆراو جۆر، لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەوە تاکو ئەمڕۆ بەردەوامە، بەڵام زۆریشی ماوە، هەروەکو گوتم بە تەواوی نەخوێندراوەتەوە.. کەواتە جەنابی مەلای گەورەش تا ئێستا هەقی تەواوی نەدراوەتێ.. دەخوازین، تا ڕادەیەك ئەم فێستیڤاڵە، لە بارەی گەورەیی جەلی زادەوە زیاتر ڕۆشنایی بەخش بێت.

## * مەزنایەتی مەلای گەورە، لە چەند جەمسەرێکەوە دروست بووە!!

کەسایەتی مەلای گەورە، هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکراوە کە لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆ و فاکتەری تایبەتی و گشتی هەڵکەوتووە.. بۆیە کەسایەتییەکەی- گەورەییەکەی- بەهەمانشت، هەمەجۆری ڕەنگی شارستانی، نەتەوەیی، واتە تەنیا ئەوە نییە بڵێین مەلایەکی چاکی کوردستان بووە و بەس..!؟ یان زانایەکی ئایینیی بووە و تەواو..!
نەخێر..! مرۆ کە بەتێکڕای ژیان و چالاکی و بەرهەمە جۆراو جۆرەکانیدا دەچێتەوە، بە تایبەتی بە جۆری بیرکردنەوە و ڕامانی لە تێکڕای ژیانی مرۆڤایەتی، لەوەش ڕۆشنتر، مرۆ بە دیوی ناوەوەی شیعرەکانی سەرسام دەبێ، کە چۆن زانایەکی ئایینیی لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووی کۆمەڵایەتی و خاوەن هەزار و یەك دەردەسەری: (نەتەوەیی، سیاسی، نەخوێندەواری) هتد.. بیرو بۆچوونەکانی کە لە ڕێگەی شیعرو نووسین و وەعزەوە، دەربڕیوون، ئەوەندە قووڵ و پڕ بەهای چەمك و زانیاری ڕووناکبیری — سیاسی — فەلسەفەییە.!!. بە کورتی، لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانم، مەلای گەورە بە کەسایەتییەکی نەتەوە پەروەری ڕۆشنبیر، هاوکات ئایین پەروەرێکی ڕووناکبیر دەژمێرێ..! جا بەپێی توانا، لەبەر ڕۆشنایی دەورکردنەوەی چەند پارچە شیعرێکییەوە، ئەویش بەکورتی و بەپەلە، ئەم نازناوە دەسەلمێنین..

## * مەلای گەورە نەتەوە پەروەرێکی ڕۆشنبیر..!!

بەر لە هەموو شتێ، هەر شاعیرێ، نووسەرێ، ڕووناکبیرێ، سەر بە هەر نیشتمان و نەتەوەیەك بن، بەتایبەتی خاکی نەتەوەییان داگیر کرابێ و هەمان کات لەژێر چەپۆکی بێگانە و چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی، ئابووری، نەتەوەیی سیاسی بناڵێنن، ئەوە بەرهەمی ئەو جۆرە خاوەن قەڵەمانە، تەنانەت تەنیا بەرووتی — مجرد — باسی جوانیش بکات، ئەوە بە گشتی ئەو بەرهەمانەی ئەدەبی، ڕۆشنبیری.. هتد، هەر هەمووی لە خانەی گیان و هەستی نیشتمانی و نەتەوەیی دەبن.. ئەوەتە مێژووی کولتووری کوردی لە بابەتاهیرەوە، تا دەگاتە ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەر چوار پارچەی کوردستان ئەوە دەسەلمێنن و دووپات دەکەنەوە، ئەو بەرهەمە هەمە جۆر و ڕەنگانە نەتەوەیین، نیشتمانین، مرۆڤپەروەرن.. هتد.. بۆیە کە بەر لەهەموو شتێ، شاعیری گەورەمان مەلای گەورە، وەکو هەر شاعیرێك ئاڵا هەڵگری ڕزگاری خاك و نەتەوەییە.. لە جەوهەریشدا شیعرەکانی مەلای گەورە بەتایبەت و تێکڕای بەرهەمەکانی دیکەی بەگشتی

دەستنوسێکی مەلای گەورە

ڕەنگدانەوەی (پەیام و هەڵوێستی و هەست و گیان و ڕێبازی کوردایەتی مەلای گەورەن، مایەی سەرنجە، مەلای گەورە، بەرلەوەی بە شیعر هەڵوێستی کوردانە و ڕێبازی کوردایەتی خۆی زۆر بە ڕۆشنی دووپات کردۆتەوە. ئەوەتە مامۆستا عەبدولخالق عەلائەدین، لە کتێبەکەیدا لەژێر سەردێڕی: (مەلای گەورە زانا و ئەدیب و شاعیر) لەبەشی دیکۆمێنتەکاندا، لە لاپەڕە (٥٩) دا، لەبەر ڕۆشنایی ناوەڕۆکی نامەکانی کاربەدەستانی ئینگلیز، لەمەڕ هەڵوێستی مەردانەی مەلای گەورە، لەبارەی جیابوونەوەی کوردستان لە دەوڵەتی عوسمانی، هەڵوێستەکە زۆر نەتەوە پەروەرانەیە، بگرە دووربین و ژیرانەیە، لەوەش زیاتر بە چاوێکی سیاسی و دبلۆماسییانە لەکاتی گفتوگۆکەی لەگەڵ بەرپرسی ئینگلیزەکان دەدوێ.. مەلای گەورە، بە دڵنیاییەوە ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە باوەشی دەوڵەتی عوسمانی بەدکار..!! هاوکات لەمەڕ کێشەی کورد (ویلایەتی موسڵ زۆر بەنەرمی و کراوەیی، بگرە بە ئومێدەوە لەگەڵ ئینگلیزەکان باس دەکات..!! بێگومان شیکردنەوەی ئەو دیکۆمێنتانەی ناو ئەو کتێبە، لەم دەرفەتە زۆر تەسکەدا زەحمەتە بکرێ.. بۆیە، بەکورتی، لەبەر ڕۆشنایی ئەو نامانە بەدڵنیاییەوە دەڵێم: (مەلای گەورە لەکاتی گفتوگۆکان و نامە دوو قۆڵییەکەدا لەگەڵ جەنابی محەمەد جەمیل حەوێزی زادە، وەکو نوێنەرێکی سیاسی، دبلۆماسی، بەناوی نەتەوەکەیەوە لەگەڵ بەرامبەریدا ڕەفتاری دەکرد..! زێدە بە کورتی، ئەو هەویرە ئاوی زۆری دەوێ، بۆیەکە، لێرەوە لەبەر ڕۆشنایی چەند پارچە شیعرێکی هەست و گیانی کوردایەتی و هاوکات هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو شیعرانەشی ئاستی ڕۆشنبیری — ڕۆشنبیری زانستی — دووپات دەکەینەوە.

دیارە پاش کارەساتی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و لە سێدارەدانی سەرکردەکانیان چۆن شەقامی کوردستان دێتە هەژان، بەتایبەتی نیشتمانپەروەرو ڕووناکبیرەکان، لەوانە جەنابی مەلای گەورە چۆن لە ڕێگەی شیعرە ناوەڕۆك دەوڵەمەندەکەیەوە، هەڵوێستی جوامێرانەی نەتەوەیی خۆی، بە شێوەیەکی ئەوتۆ ئاشکرای کردووە، ویژدانی زیندوو بۆ تێکڕای کوردستان دەگرێتێ..!! لەوەش زیاتر لەناخەوە هاوار دەکات، بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی لەخەوی غەفڵەتە هۆشیار بنەوە، بۆ ئەوەی لە ژێر دواکەوتنی کۆمەڵایەتی، هەژاری، خوێندەواری ڕزگاریان ببێ.. ئەوەی ڕاستی بێ مرۆکە ئەو شیعرەی لەژێر سەردێڕی: (من یەخەی خۆم لە بۆیە دادەڕم..) سەرسام دەبێ، ئەو لە کوێیە، بۆ برایانی جەزیرە و بۆتان خەمی دونیا دەگرێتەوە.. هتد.

دیارە، هەر وەکو ئاماژەم پێ کردووە، ئەم شیعرە پاش دامرکاندنی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، لەلایەن تورکە فاشستەکانەوە گوتراوە:

فەرموویەتی:

**من یەخەی خۆم لە بۆیە دادەدڕم**

**من یەخەی خۆم لە بۆیە دادەدڕم**
**ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم**
**دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ**
**قەومی من وا ڕەزیل و ڕیسوابێ**
**بێ کەسو بێ دەر و فەقیر و هەژار**

**بێ سەر و سەرفراز و بێ سەردار**
**ئەوەی ڕێگای لە کوردەکان گۆڕی**
**لەعنەتی خوا لە ئەلحەدو گۆڕی**
**هتد...**

هەروەکو گوتم، گەورەیی مەلای گەورە و ئاستی خەمخۆری و قووڵیی گیانی نەتەوەیی، زۆر بە ڕۆشنی لە جەوهەری شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، بگرە هەر پارچە شیعرێکی لە بەیاننامەیەکی سیاسی، نەتەوەیی، ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی دەکات.
هەمدیسان، هەر لە لایەنی نەتەوە پەروەریی مەلای گەورەوە، ئەو شیعرەی کە لەژێر سەردێڕی (ئاهو ناڵە)دا، نموونەیەکی دیکەی بەهێزی هەڵوێستی نەتەوەیی و سیاسی مەلای گەورە بە توندی دەسەلمێنێ، لەوەش زیاتر ناوەڕۆکی ژمارەیەك بابەتی کۆمەڵایەتی، نیشتمانی، ئایینیی، دەوری هەندێ شێخ و مەلاکان لەخۆ گرتووە، زێدە مایەی سەرنجە.. بە کورتی ئەم شیعرەشی نموونەیەکی دیکەی ئاستی ڕۆشنبیری و قووڵیی گیان و خەمخۆری مەلای گەورە دووپات دەکاتەوە.

**ئاهو ناڵە**
**هەتا دەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم**
**عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم**
**بەزۆری جاهیل و نەخوێندەوارن**
**لەلای نەوعی بەشەر بێ قەدرو خوارن**
**کەسێ قەدری لەلای خزمان نەمێنێ**
**لەلای بێگانە قەدری چی دەمێنێ**
**لەگەڵ یەك بەدڕەوشت و بەدنیهادن**
**لەبۆیە وا کەساد و بێ مرادن**
**لە عیلم و مەعریفەت دوون بەکوللی**
**خەیاڵی خاوە لایان فیکری میللی**
**حەسوودن بۆیە بازاڕیان کەسادە**
**نەزانن بۆیە تاعەتیان فەسادە**
**لەسەر عەردی ئەوی کوردی زوبان بێ**
**دەبێ زەبال و کەناس و سەپان بێ**

تێکڕای شیعرەکانی مەلای گەورە (٤٠) چل دەقە شیعری هەمەچەشنن.. دیارە، هەروەکو سەلمێنراوە، ئەو شیعرانە لە ڕوانگەی هەڵوێستی هەمەجۆری سیاسی، نەتەوەیی، ئاستی بەرزی ڕۆشنبیری و ڕاو بۆچوونی کۆمەڵایەتی و مرۆڤپەروەرییەوە گوتراون.. بۆیە کە لێرەدا زەحمەتە، واتە لەم کورتە نووسینەدا ناتوانرێ تەنیا ناونیشانی شیعرەکانی شیبکرێنەوە دووبارە و سێ بارە گەورەیی هەمەلایەنی بخەینە بەرچاوان...! بۆیە ناچارین، بەکورتی ئاماژە بە هەندێکیان بکەین، بەپەلە پێناسەیان بکەین، بۆنموونە دووربینی مەلای گەورە لەبارەی لاوانی کوردەوە - هەستە پێشکەوە - خۆی لە خۆیدا مانیفێستێکی کۆمەڵایەتی — شارستانی، زانستییە.. هتد، مەلای گەورە لە ڕێگەی ئەم شیعرەوە، وەك ڕۆشنبیرێکی سیاسی ڕووناکبیری ئەم سەردەمەمان زۆر بە وردی و زانستیانە دەوری لاوان لە کۆمەڵی کوردەواری دەست نیشان دەکاو بە (هێزو دڵ و ئاواتی ژیان) یان دەژمێرێ.. هەروەها داوا لە لاوانی کورد دەکات، کە لە کاروانی خەبات دوانەکەون و پەیڕەوی زانست و بیری نوێ بکەن، بۆ ئەوەی کۆت و زنجیری کۆنە پەرستی و دیلیەتی ورد و خاش بکرێ، بەوەش نەوەستاوە، بەراوردێکی وردی لەنێوان بایەخ و دەوری زانست لە پێشکەوتنی ژیاندا، لەگەڵ کردەوەی پڕو پووچ و قسە و کردەوەی بێ کەڵك ئەنجامی داوە:
**هەستە پێشکەوە ئەی لاوی کۆیی**
**ئاگات لەخۆبێ کاروان ڕۆیی**
**بە نووری عیلمی ڕێگا بەدەرخە**
**بەزۆری بازو باری بەسەرخە**
**بەباڵی عیلم بفڕە وەك تەیران**
**بەهێزی عیلم هەڕۆ بن بەحران**
**عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە**
**(قال) و (قول) گشتی هەبایە**
**عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە**
**بەخوا نازانی خوا چی کردووە.**
**هتد..**



مەلای گەورە

## * مەلای گەورە و کێشەی نەوتی کوردستان

مەلای گەورە. هەرچەند ڕاستەوخۆ، ناڕاستەوخۆ ئەندامی هیچ گروپێکی سیاسی، یان دەزگایەکی سیاسی، یاخود دەرچووی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان نەبووبێ، لەوەش زیاتر ئەندامێکی حیزبێکی گەورە، یان بچووک بوو بێت، کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ (سیاسەتمەدار) ئەگەر نەخوێندەواریش بێت..!!
لەوەش ڕۆشنتر لە سەردەمی ئەودا، جووڵانەوەی سیاسی لە کۆمەڵی کوردەواریدا بەواتایەکی دیکە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان، وەکو ئەمڕۆ بەرفراوان و قووڵ نەبوو بوو..!! کەچی دەبینین مەلای گەورە، بەپێچەوانەی بارودۆخی دواکەوتووی ئەوسای کوردستان، وەك سیاسییەکی پسپۆڕ — نموونەی کامل چادرچی — نیشتمانپەروەرێکی ڕەسەنی ئاڵا هەڵگری کوردایەتییەکی ڕاستەقینە، لە مەڕ مەسەلەیەکی زێدەی گرنگ و چارەنووسساز و ناسك و هەستیارەوە، کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی باڵای ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە، ئەوەیش مەسەلەی نەوتی کوردستانە، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دواڕۆژی ئابووری و سەربەخۆیی کوردستانەوە هەبووە، لەوەش گرنگتر پەیوەندی بە مەسەلەی داگیر کردن و دزینی سامانی نەتەوەییەوە بەند بووە.. جا لێرەدا، لەمەڕ ئەو مەسەلە هەرە گرنگەی نەتەوەیی، مەلای گەورە، زۆر ئازایانە، بەگیانێکی نیشتمانپەروەری و هەڵوێستێکی سیاسییانە دژی ئیمپریالیزم و دار و دەستەکەی بە شیعر ڕای خۆی دەربڕیوە، ئەو هەڵبەستەی لەژێر سەردێڕی (هەناسەی نەوتاوی)، بگرە (هەناسە هەڵکێشان و پاڕانەوە)یە، ئەم شیعرە لووتکەی هەڵوێستی ڕاستەقینەی کوردایەتی مەلای گەورە دەسەلمێنێ.
هەڵبەت، قسە کردن لەمەڕ کێشەی نەوتی کوردستان و مەسەلەی ویلایەتی موسڵ و خودی شاری کەرکوك، ئەوە زۆر هەڵدەگرێ، بەهیچ جۆری، لەم چەند لاپەڕەیەدا جێیان نابێتەوە، بۆیە لەبارەی ئەو شیعرە: (سیاسی — نەتەوەییە) بەوەندە واز دێنم چەند دێڕێکی دەخەینە بەرچاوان:

### هەناسەی نەوتاوی

**خاکێکی هەیە وڵاتی کوردی**
**ئیکسیرە وەلێ لە چنگی مردی**
**خاکێکی ئەوەندە پاك و ڕەنگین**
**قەومێکی ئەوەندە فەقیرو بێ تین**
**ئەی کاکی نەفامی گەوجی مل هوڕ**
**بنواڕە لە دەوری بابە گوڕ گوڕ**
**ئەو قوەتە چی بوو، چۆن بەدەرکەوت**
**چۆن هەر دەکوڵێ مەنابیعی نەوت**
**ئەو نەوتە بوو ئاگری هەڵای ساند**
**چەند دەوڵەت و تاج و تەختی فەوتاند**
**بۆ ئەو نەوتە بوو کە چواردە ملیۆن**
**عەسکەر لە فەرەنگ و نەسلی مەیموون**
**بۆی هاتە نزاع و حەرب و کوشتن**
**تاکو بەمەرامی خۆگەیشتن**
**ئەو نەوتە چیبوو. حەیاتی تۆ بوو**
**وەی خۆڵ بەسەر ئەویش ئەوا چوو**
**ئەی کوردی نەفامی خانە وێران**
**وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران**
**هتد..**

ئەوەی لەو چەند لاپەڕەیەدا، باسمان کرد، تەنیا خوێندنەوەیەکی کورت بوو لەمەر نازناوی مەلای گەورە: نەتەوەپەروەرێکی ڕۆشنبیر..
لەبەشی دووەمی ئەم کورتە نووسینەدا، لەژێر سەردێڕی مەلای گەورە (ئاین پەروەرێکی ڕووناکبیر دەدوێین: هەڵبەت ئەم بەشەش زۆر بە کورتی دەبێ، پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە جەنابی مەلای گەورە، گەورەییەکەی ژمارەیەك بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، خوێندەواری نەتەوەیی گرتۆتەوە و بگرە پسپۆڕ و لێزانێکی وردبین و خاوەن هەڵوێستێکی جوامێر و ڕاستگۆ بووە، لەوەش گرنگتر، کە پەروەردەی بنەماڵەیەکی ئایینی ناسراو بووە، خۆیشی لەو حەوزە زانستییە پەروەردە بووە، هاوکات ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی ئایین پەروەر بووە، ئەوجاش لە ڕوانگەی بیرو فەلسەفەیەکی کراوەی هاوچەرخ ڕووبەڕووی ژمارەیەك هەڵگرانی بیرو بۆچوونی کۆنەپەرستی و داب و نەریتی پڕو پووچی،

یان مێشك بۆگەنی هەندی شێخ و مەلا و پیاوی ئایینیی سەردەمی خۆی بووەتەوە، زۆر بوێر و زانستانە لە ڕێگەی شیعرەکانییەوە ڕیسوایان دەکات.. لەوەش گرنگتر مەلای گەورە لەڕوانگەی بیرێکی پێشکەوتوو، لەبەر ڕۆشنایی چەمکی مرۆڤ پەروەری و پیرۆزی ژیان و دەوری هەرە گرنگی زانست بە هەموو بەشەکانییەوە - لە پێشکەوتنی کۆمەڵگەدا دەست نیشان دەکا..
بەڵێ مەلای گەورە، بەپێی سەردەمی خۆی بەو شیعرانە ڕاپەڕینی کی ڕووناکبیرانە بەرپا دەکا..! واتە خودی مەلای گەورە، وەکو کەسایەتییەکی هەڵکەوتووی هەمە توانا و بەهرە و زانست – زانست عارد و ئاسمان – ئەگەر ڕووناکبیرێکی – منەوەر – گەورە و ڕاستەقینە نەبوایە، چۆن زانایەکی ئایینیی لەو پایە گەورەیەدا، ئەوەندە هەڵوێست بوێرو بیری ڕۆشگەری دەبوو؟
بۆیەکە مەلای گەورە، بە ئایین پەروەرێکی ڕووناکبیر دەژمێررێ، هاوکات بە ڕووناکبیرێکی ئایین پەروەر دەژمێررێ.
زێدە بەکورتی، هەر وەکو ئاماژەم پێ کردووە، جەنابی مەلای گەورە، (گەورەییەکەی) لە چەند جەمسەرێکەوە وەدەستهێناوە، جا بۆ دیاریکردنی ئەو پایەش، دەبێ بەوردی سەرتاپای شیعر و بەرهەمەکانی لەبەر ڕۆشنایی زانستی هاوچەرخدا شی بکرێتەوە، ئەوسا بە تەواوی ئەو مرۆڤە مەزنە، شوێنە ڕەواکەی خۆی لە ژیانی کورد و گەورە پیاوانی کوردستان بۆ نەوەی نوێ – دەست نیشان دەکرێ..! ئەوەش بێگومان لێرەدا زۆر ئەستەمە بکرێ، هاوکات بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانم لەمەڕ ئەو بەشەدا، ئەوە دەقی چەند پارچە شیعرێکی دەخەینە بەرچاوان:

### هەتا شێخی بمێنێ

**هەتا شێخی لە کوردستان بمێنێ**
**ئومێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ**
**تەریقی قادری و نەقشبەندی**
**بەبایدا ڕەونەق و ئاهەنگی کوردی**
**هەموویان بوونە سۆفی و پیرو دەروێش**
**بە بەرماڵ و بە سبحەو ڕشتەو ڕیش**
**هەموو بێ ئیش و بێ کارو تەوەزەل**
**ورگ پان و مل ئەستوور و سەلك زل**
**لە وان و ئەرزڕۆم تاحەددی جافان**
**تەوەللا بوون لە عەقڵ و عیلم و عیرفان**

هەروەها فەرموویەتی:

**خۆزیا ئیمامی ڕازی لەم عەسرە زیندووبایە**
**تا لە سونعی بەشەری تەیارەی بدیبایە**
**ئەوجا ئیمانی دەینا بە قودرەتی بەشەری**
**قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری**
**چونکە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد**
**ئۆمەتی وا بە قودرەتی گشتی بە زیندوویی مرد**
**پاکیان بە دەف و دەمبك، بە دوعاو نووشتە و کشتەك**
**مەحروم بوون لە ئاسایی سونعی دەواری فەلەك**
**رواة (الدار قطنی) «حدثنا التذمزی»**
**پاکی لە کیس ئێمەدا لە واپۆرو تاکو دەرزی ... هتد**

ڕاستییەکەی هەر دێڕێك لەو شیعرانە بابەتێکی سەربەخۆ لە نووسیندا دروست دەکەن.. سەرتاپای ئەو شیعرانە نیشانەی بلیمەتیی و ئاستی زانستیی و ڕووناکبیریی مەلای گەورە دەنوێنن...
لەکۆتاییدا، لەمەڕ ئەو شیعرە (خۆزیا ئیمامی ڕازی) ڕاو بۆچوونی مامۆستا مەسعود محەمەد کاتی خۆی بۆ منی نووسیبوو، دووبارەی دەکەینەوە:

* مامۆستا مەسعود محەمەد فەرموویەتی:

(لێرەدا مەلای گەورە هێرشێکی توند و تیژ دەباتە سەر مەزهەبی (جەبری)، کە هیچ کەسێك تا دەوری ئەو و دوای ئەویش نەیوێراوە ئەم هێرشە بباتە سەری، هەر بەوە ڕاناوەستێ خۆ خەریك کا لەگەڵ پیاوە ئایینییە بێ دەسەڵاتەکان، بەڵکو هێرشەکەی دەگەیەنێتە سەرچاوەی باوەڕەکە و فەیلەسووفە زلەکانی دەخاتە بەر تیشکی ڕەخنەکەی و، لەڕووی ڕەخنەی سادەشەوە نادوێ، بەڵکو بەرهەمی کتو متی مەزهەبەکە دەکا، بەهۆی ئەو ئەنجامە کوشندانەی کە یەخەگیری پەیڕەوکەرانی مەزهەبەکە بوون).
دووبارە دڵێم، لەو مەقامەدا هەر ئەوەندەم بۆ کرا، لەبارەی ئەو مرۆ مەزنەوە دەور بکەم.

**سەرچاوەکان:**

١- کتێبی مەلای گەورە - مومتاز حەیدەری

٢- عەبدولخالق عەلائەدین، دیوانی مەلای گەورە

**دەرەنجام:**

مەلای گەورە لە میانەی هۆنراوەکانیدا زۆر بە ڕوونی دەبینرێت کە تا چ ئەندازەیەك پسپۆڕی بواری خواستەکان بووە و چەمکی بەرژەوەندی لای ئەو دەورێکی بالآی بینیوە لە تێکڕای بیرو بۆچوونە فەلسەفییەکانی، پێشەوا دوای خوێندن و بەدواداچوونی زانستە شەرعییەکان کە تێکستی دیاری کراون ئەوەی لا گەلاڵە بوو کە پێویستە دەقەکان بە جۆرێکی تر و لە دەلاقەیەکی تر سەیر بکرێن بەڵکو بتوانرێت:

یەکەم: گرۆتینێکی زیاتر بدرێت بە دەقەکان و زیاترینی خەڵکی بێن بەرەو پیریەوە.

دووەم: دەقەکان لە دوو توێی پەڕاوەکان دەربچێت و لە مەیداندا کاریگەری خۆی بنوێنێت.

سێهەم: بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی سەردەم ئاشکراتر بن و هەوڵدان بۆ دابین کردنیان بە ئەرکێکی ئایینیی و فیکری کولتووری شارستانی بزانرێت.

چوارەم: بۆ ئەوەی دەقەکان لەژێر باری هەڵە خستنە گەر دەر بێت و ئەوە ڕۆشنکاتەوە زۆرن ئەوانەی بە بیانووی ئایینەوە و بە بەرگی دینداریەوە هەوڵی خۆ سەپاندن دەدەن و قسەکردن لە ئایین و ئاینداری تایبەت دەکەن بەخۆیان.

پێنجەم: ئەو ئامانجە ڕەسەنانە دەربخرێت کە شەریعەتی لەپێناودا هاتووە.

لێرەدا مەلای گەورە بە سێ سیفەت ئاسا توانیوویەتی مامەڵە لەگەڵ شەریعەتدا بکات:

یەکەم: شەریعەتی ئیسلام بۆ هەموو کەسێك و هەموو کولتوورێك وەکو یەك وایە، بۆ هیچ نەتەوەیەك نەهاتووە کە خۆی بسەپێنێت بەسەر نەتەوەیەکی تر بەناوی ئایینەوە.

دووەم: شەریعەتی ئیسلام بۆ هەمەلایەنە بۆ تێکڕای بوارەکانی ژیانی مرۆڤ کە پێویستی پێیەتی، وە نابێت مرۆڤی موسوڵمان گومانی لەوە هەبێت کە شەریعەتی ئیسلام دور و نزیك هەموو زانست و بوارە فەلسەفییەکان دەگرێتەوە.

سێیەم: مەلای گەورە باوەڕی وابووە کە شەریعەت واتە کردەوە و کۆڵنەدان، نەوەك بریتی بێت لە دوعا و پاڕانەوە و دۆشدامان.

**پەراوێز:**

١- ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە، بەگشتی بە کورتی لەبەر ڕۆشنایی مەزنایەتی مەلای گەورە نووسراوەتەوە، واتە لەبەر کەمی دەرفەتەکە، کەمتر نمونەی دەقی شیعریی بەکارهاتووە.

# مەلای گەورە...
# خوێندنەوەیەک لە
# کڵاوڕۆژنەی شیعر و
# بەرهەمەکانییەوە

ڕێبوار جەمیل-زانکۆی سەلاحەدین

## مەلایەکی منەوەر

مەلا محەمەدی حاجی عەبدوڵڵای مەلا ئەسعەدی جەلی زادە، هەتا نەڵێی مەلای گەورە کەم کەس هەیە بیناسێت، ئەم مەلا منەوەرەی کورد لە ساڵی ١٨٧٦ لە شاری کۆیە لە دایکبووە، هەر لە سەرەتای منداڵییەوە بەبلیمەتی و گەورەییەوە دەرکەوتووە، لە تەمەنی ١٨ ساڵییەوە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی سەردەمی دەرکەوتنی بووە وەك ڕۆشنبیر و مەلایەکی خوێندەوار و بە ئاگای دونیای ئەدەبیات و ئایینناسی و زانستەکانی زمان.

مەلای گەورەی کۆیە، بەدەر لەو کتێب و بەرهەمە ئایینیانەی لەدوای خۆی بەجێی هێشتوون، دەیان هەڵوێستی مرۆڤدۆستی و پێشکەوتنخوازی هەیە کە تا هەنووکە لە کۆمەڵگەی کوردیدا ئاماژەی بۆ دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی هەندێ بەرهەمی ئایینی نزیکەی پێش یەك سەدە لەمەوبەر نووسیوویەتی و تا ئێستاش بە یەکێك لە کتێبە سەنگینەکانی کتێبخانەی ئایینی دادەنرێت لە کوردستاندا، ئەمە جگە لە تەفسیری قورئانی پیرۆز بە زمانی کوردی بەناونیشانی (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی) بەچەند بەرگێك نووسیوەوە، ئەم تەفسیرە بە یەکێك لە تەفسیرە ڕوون و بێگەردەکانی قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ دەکرێت و دەیان تەفسیری تری کورد بەدوای ئەودا دەگەڕێنەوە بۆ تەفسیرەکەی ئەم لەمەڕ قورئانی پیرۆز.

هەر لەو بارەیەشەوە و لە پێشەکی ئەم تەفسیرەکەدا مەلای گەورە خۆی دەڵێت "گەلێجار بە دڵم دا دەهات کە تەفسیرێ بە زوبانی کوردی دانێم، تا خوێندەوارانی کورد لە کەلامی خۆیان تێبگەن و بەڕێ نیشاندانی قورئان، ڕێ بۆ مەنزڵی نەجات ببەن... ئەمما بێ هێزیی خۆم و بێ مەیلیی قەومی کورد، منیان لەوکارە خێرە ڕاگیر کرد. تا لەو ڕۆژانەدا دەستەیێ لە جوانان و لاوانی کورد، کە هەریەك بۆ دەستیار و یاوەری ئەنگوستی بۆ (اشتیاق) و ئارەزووی خۆیان نواند،

که تەفسیرێ بە کوردی لەسەریەك دانیم... زۆر پێ کەیف خۆش بووم... منیش که (جەلی زادە) کاکە حەمەم پێ ئەڵێن، دەستم پێکرد، بە تەفسیری قورئانی حەکیم و ناوم لێنا (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی)."

لە کاتی خوێندنەوەی ئەم تەفسیرەدا خوێنەر هەست بە هیچ جۆرە هیلاك بوون و ماندوویەتییەك ناکات، چونکە بە زمانێکی روون و بە تام و چێژێکی تایبەتی و بە هێنانەوەی دەیان نموونەی شیعری حاجی قادر و پەند و بەڵگەی گرنگ هێناوەتەوە، بەبڕوای من ئەم تەفسیرە گەر ئەو سەردەمە مەلای گەورە بە عەرەبی بینووسیایە ئەوا بە دڵنیاییەوە هیچ لە تەفسیرەکانی تەبەری و ئیبن عەرەبی و رازی و ئیبن ئالووسی کەمتر نەدەبوو، بەڵام ئێستاش لە زمانی کوردیدا ئەم تەفسیرە بە یەکێك لە تەفسیرە گرنگەکانی قورئانی پیرۆز ئەژمار دەکرێت و کاریگەریی زۆری لە ڕووی بەلاغە و زمانەوانییەوە هەیە.

کتێبێکی تری مەلای گەورە بەناونیشانی (المصقول فی علم الاصول)بە زمانی عەرەبی نووسیووە، تا هەنووکەش ئەم کتێبە بە یەکێك لە کتێبە گرنگەکانی بواری (زانستی ئصول) دادەنرێت، کە بە میتۆدی زانستی لۆژیك و توانایەکی بەرزی زمانەوانی تێدا بەکارهاتووە، ئەم کتێبە تا هەنووکەش وەك سەرچاوەیەکی گرنگی بواری یاسا و شەریعەت لە کۆلیژی یاسا و شەریعە دەخوێنرێت، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی بەهەشتی لە شوێنێکدا ئاماژە بە گەورەیی ئەم کتێبە دەکات و بە یەکێك لە کتێب و بەرهەمە دانسقەکانی دونیای ئیسلامی ناودەبات و پێی وایە ئەم کتێبە جیهانی ئیسلام دەبێت شانازی پێوە بکات، بەتایبەتیش لەو شیکارە وردانەی بیردۆز زانستی لۆژیك و بەها پیرۆزییەکانی مرۆڤ لە ئاین و شەریعەت.

خوێندنەوەی مەلای گەورە چ لە تەفسیری قورئانەکەی و چ لە کتێبی ئسوڵەکەیدا زیاتر پشت بە لۆژیکی بیرکردنەوە و تێڕامان و پرسیاری مرۆڤ لەو بەرهەمانە و لە میتۆد و پەیامانە دەبەستێت کە گرنگە بۆ ژیان و بەرنامەی مرۆڤ، پێچەوانەی ئەو سەرچاوە و تەفسیرە عەرەبییانەی کە هەموویان لە چوارچێوەی یاریکردنی زمانەوانی و هەندێ پەند و باسی وشك و چەقبەستوودا دەخولێنەوە.

## شیعر وەك دەروازەیەك بۆ ڕەخنەگرتن

لایەنێکی تری دیار و گەشاوەی ئەم مەلا خوێندەوارەی کورد بەرهەمە شیعر و ئەدەبیەکانییەتی، بەتایبەتیش شیعر، کە ئەو کات ئەو شیعری دەنووسی هەستی نیشتمان پەروەری و خۆشەویستی نیشتیمان و ناسیۆنالیزمی کوردی بە چەندین هەوراز و نشێودا تێدەپەڕی، هەر بۆیە کۆمەڵێك لە شیعرەکانی مەلای گەورە بۆ پرسی نیشتمانی و نەتەوەیی و هەستێکی ڕەخنەگرانە تەرخان کراوەو بە زمان و ئاستێکی بەرزی تەکنیکی شیعری رەخنە لە کورد و هەستی نیشتمانی و بێ باکی تاکی کورد دەگرێت، ئەمە جگە لەوەی هەندێ لە شیعرەکانیدا ڕەخنە لە کۆی سیستەمی باوی خورافە و دواکەوتوویی و پەرستشی کوێرانە دەگرێت و پێی وایە پێویستە مرۆڤ بە هۆشیاریی و مەنتقەوە خواپەرستی و نەتەوەویستی و هەموو شتەکانی تر بکات، نەك کوێرانە دوای بکەوێت، بۆ ئەم مەبەستەش هەرگیز مەلای گەورە سڵی لە ڕەخنەگرتن لە شێخ و مەلا نەکردووەتەوە، چ لە ژیانی رۆژانەی خۆیدا، چ لە بەرهەمە شیعر و ئەدەبییەکانیدا، بۆ نموونە لە شیعری (هەتا شێخێ بمێنێ) بزانن چۆن رەخنە لەو بیروباوەڕە کوێرانە دەگرێت و بە شیعر دایان دەشۆرێت:

**هەتا شێخێ لە کوردستان بمینێ**
**ئومێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ**
**تەریقی قادری و نەقشبەندی**
**بەبای دا ڕەونەق و ئاهەنگی کوردی**
**هەموویان بوونە سۆفی و پیرو دەروێش**
**بە بەرماڵ و بە سبحەو رشتەو ڕیش**
**هەموو بێ ئیش و بێ کارو تەوەزەل**
**ورگ پان و مل ئەستور و سەلك زل**
**لەوان و ئەرزڕۆم تا حەدی جافان**
**تەوەلا بوون لە عەقڵ و عیلم و عیرفان**

(تەوای ئەم شیعرە لە پاشکۆی شیعرەکانی مەلای گەورەدا لە بەشی کۆتایی رۆڤاردا بلاوکراوەتەوە) لەسەردەمی خۆیدا و ئەم شیعرانە و چەندانی تریش لەلایەن مەلا نەخوێندەوار و کەسە تێنەگەیشتووەکانی ئاینەوە کەوتووەتە بەر ڕەخنە، بەڵام مەلای گەورە سڵی لە ڕەخنەگرتن نەکردووەتەوە هەمیشەش ئەوەی باوەڕی پێی بووە بە راشکاوی و بە ئازایانە خستوویەتییە روو، ئەم راشکاوییشە وای لێکردووە

هەموو کەس حەز بە بەرهەمەکانی نەکات و بەردەوام گێچەڵی بۆ دروست بکرێت.
لە شیعرێکی تریشیدا بە ناونیشانی (هەناسەی نەوتاوی) مەلای گەورە لە گۆشەنیگا و لایەنێکی ترەوە کە ئەمیش جۆرێك لە هەستی نەتەوایەتی و کوردپەروەریی پێوە دیارە باس لە نەوتی بابەگوڕ گوڕ و داگیرکردنی و ئینگلیز و نەفامی و دواکەوتوویی کورد دەکات و بە زمانێکی بەرزی ڕەخنەگرانە ڕەخنە لە کورد و هەموو ئەو کەسانە دەگرێت کە بوونەتە ڕێگر لەبەردەم بەدەستهێنانی مافی کورد و خۆماڵی کردنی نەوت و پرسی ئازادبوون، لەو شیعرەدا مەلای گەورە هۆکاری داگیرکاری و پێشێلکاری مافەکانی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ گرنگی نەدانی کورد بە زانست و فێرکاری و شارەزانەبوون لە لایەنە جیاوازەکانی زانست و فێرکاری، سەیری ئەو توانا بەرزەی زمان و داڕشتن و تەکنیکی شیعری مەلای گەورە بکەن لەم شیعرەدا کە چۆن باس لە گرنگی و بایەخی نەوت دەکات:

**هەناسەی نەوتاوی**

**یا ڕەببی بە لوتف و جود و ئیحسان**
**لوتفێکی بکەی لە حەقی کوردان**
**قەومێکی فەقیر و ناتوانا**
**بێ پەروەر و بێ پیاوی دانا**
**بێ مورشید و عالمی سیاسی**
**بێ (مصدر) (قاعدەی) ئەساسی**
**بێ ڕووح و حەیاتی ئیجتیماعی**
**بێ قودرەت و قووەتی دیفاعی**
**بێ دەفتەر و کاغەز و کیتابەت**
**بێ سنعەت و حیرفەو کەسابەت**

ئەوانەی لەسەر مەلای گەورە نووسراون بە دەر لەم دیوانە شیعر و کتێبانەش، تا ئێستا چەندین کتێب و وتار و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر لەسەر

مەلای گەورە نووسراون، بەڵام لە هەموو ئەوانە گرنگتر، ئێمە لێرەدا ئاماژە بۆ دوو کتێب دەکەین کە لەسەر ئەم منەوەرەی کورد نووسراون، کە هەر یەکەیان تا هەنووکە بەها و کاریگەریی خۆیان هەیە و پێم وایە لەو دوو کتێبەوە دەتوانین بە بەشێکی گرنگی ژیانی ئەدەبی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و رامیاری مەلای گەورە ئاشنا بین، کە ئەوانیش یەکەمیان بەناونیشانی (مەلای گەورە زانا و ئەدیب و شاعیر) کە لەلایەن عەبدولخالق عەلادینەوە نووسراوەو تا ئێستا دووجار چاپ کراوەتەوە و بە یەکێك لە کتێبە سەنگینەکانی کتێبخانەی کوردیمان ئەژمار دەکرێت لەسەر ئەو زاتە گەورەیە، دووەمیان بە زمانی عەرەبی بەناونیشانی (محمد بن عبدولله الجلي وجهود العلمیە)کە لەلایەن دکتۆر جەواد فەقێ نووسراوەو نامەیەکی ئەکادیمییە و تیشکێکی هەمەلایەنەی خستووەتە سەر ژیان و بەرهەمەکانی مەلای گەورە، لەم کتێبەدا کە بەزمانی عەرەبییە خوێنەر دەتوانێت زۆر زانیاریی و شتی گرنگ بەدەست بێنێت کە رەنگە پێشتر نەیبیستبێت، بەتایبەتیش خوێنەرێکی عەرەب، ئەم کتێبە دەکرێت بە یەکێك لە کتێبە باشەکانی ئەو بوارە ئاماژەی بۆ بکەین و سەرچاوەیەکی بەسوودی ناسینی ئەو زانا گەورەیەی نەتەوەکەمان بێت.

دیارە مەسعود محەمەدی کوری مەلای گەورەش لە کتێبی (گەشتی ژیانم) ئاماژەی زۆر گرنگ و پڕ بایەخی بە ژیان و ئاستی رۆشنبیریی و زۆر لایەنی تری باوکی داوە و لێرەدا نامانەوێت دووبارەی بکەینەوە، ئەوەندە نەبێت ویستمان لەم نووسینەدا سەرە قەڵەمێك لە ژیان و بەرهەم و کلاورۆژنەی شاکارەکانی ئەو مەلا منەوەرەی کورد بۆ خوێنەران بخەینە روو.

*** بینین لە ژیان و بەرهەمەکانیدا**

مەلای گەورە وەك یەكێك لە ڕۆشنبیر و خوێندەوارە ئاینپەروەرەکانی میللەتەکەمان لە نێوان ساڵانی ١٨٧٦ — ١٩٤٣دا ژیاوە، بەرهەم و جیهانبینی ئەم شاعیرە بەراورد بە شاعیرانی کلاسیکی کوردی و ڕۆشنبیرە دیارەکانی سەدەی نۆزدە و بیستی نەتەوەکەمان هیچی کەمتر نییە و بگرە لە زۆر ڕەهەند و لایەنیشەوە هەست بە قوڵیی و بەرفراوانی هەستی هۆشیاریی لای ئەم شاعیر و ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەرە لە ئاستێکی زۆر بەرز و گەورەدایە، دەرکەوتنی مەلای گەورە لە کوردستان و لەو ژینگەیەی تێیدا ژیاوە هاوکات بووە لەگەڵ چەندین گۆڕانکاری ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوری هەرێمی کوردستاندا ، بە تایبەتیش لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی جەنگی جیهانی یەکەمدا، کە ئەم ڕووداوانە کەم تا زۆر کاریگەریی و ڕەنگدانەوەیان لە شیعر و جیهانبینی ئەودا جێهێڵاوە، ئەو کاریگەرییەش بە تەنها لە شیعر و هەڵسوکەوتیدا ڕەنگی نەداوەتەوە، بگرە لە تەفسیری قورئانەکەی و تەنانەت کتێبەکانی تایبەت بە (نەحو صرف و ئوصول)یش ئەو ڕەنگدانەوەیە دەبینرێت.
ئەگەر سەیری ئەو فرە ڕەهەندییە لە بەرهەمەکانی مەلای گەورەدا بکەین، بە تەنها لایەنی ئاینپەروەری و مرۆڤدۆستی نابینرێت، بەڵکو بە ئاگابوونی ئەو لە شیعری حاجی قادری کۆیی دا هێندەی تر هەستی نیشتمان پەروەری لا گەورەتر دەبێت و ئەو کاریگەرییەش لە ژیانی ڕۆژانە و بەرهەمە شیعرییەکانیدا ڕەنگدەداتەوە، بە تایبەتیش لە شیعرەکانی (ئەم میللەتە، ئەگەر عیزت دەوێ، من یەخەی خۆم لە بۆیە دادەدرم) کاتێك ئەم شیعرانەی دەخوێنیتەوە، هەست بەوە دەکەیت درێژە پێدەری هەمان ڕیتم و ڕێباز و شێوازی شیعریی حاجی قادری کۆییە، بەڵام بە شێوازێکی جیاوازتر و ڕوونتر و ڕەوانتر لە گەیاندنی مانای شیعریی و وێنەکاندا، ئەمە جگە لەوەی بەشێك لە شیعرەکانی تایبەت کردبوو بۆ وەڵامدانەوەی شێخ و ئاغا و دەروێشان، کە لەو سەردەمانەدا زۆر هەوڵیان دەدا دواکەوتووی میللەتی کورد لەو قۆناغەدا بۆ مەرامی دواکەوتویی خۆیان بەکار بێنن، هەمیشە مەلای گەورەش وەك پیاوێکی ئاینی و ڕۆشنبیرێکی دیار لە ململانێ و کێشەدا بووە لەگەڵیاندا، چ بە شیعر چ بە وتار و چ بە کۆبوونەوەی جەماوەریی دژ بەو بیرە دواکەوتووانەی ئەو قۆناغەی کۆمەڵگەی کوردی بووە، تەنانەت دەگێڕنەوە زۆرجار مەلای گەورە لە کۆبوونەوە و مەجلیسی گەنجان و لاوانی کۆیە و هەولێردا بۆ سەلماندنی وتە هاندانی خەڵك بۆ خوێندن و خوێندەواری وتوویەتی "بخوێنن و بەدوای زانست و زانیاریدا وێڵ بن، بەخودای ئەگەر پیاوچاکانی سەرەتای ئیسلام لە ئێستادا بژیانایە لە ئێستادا لە پێشبڕکێدا دەبوون بۆ فێربوون." هەر بەو بۆنەیەشەوە لە پارچە شیعرێکیدا کە ڕەنگە هەر لەو بۆنانەدا وتبێتی کە دەڵێت "

**خۆزیا ئیمامی ڕازی لەم عەسرە زیندووبایە**
**تا لە سونعی بەشەری تەیارەی بدیبایە**
**ئەوجا ئیمانی دەینا بە قودرەتی بەشەری**
**قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری**
**چونکە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد**
**ئۆمەتی وا بە قودرەتی گشتی بە زیندوویی مرد**

بوونی ئەم پارچە شیعرە، هەمان ئەو وتەیەی پێشوومان دەسەلمێنێت لەسەر هاندانی لاوان و هاوڵاتی کورد لەسەر خوێندن و زانست و خوێندەواری.
مەلای گەورە، هەموو شیعرەکانی ناگەنە پەنجا شیعر، پێشتر ٤٠ شیعری بڵاوکراوەتەوە و لە فەوتان پارێزراوە، ئێستاش چەند شیعرێکی ئەو شاعیرە هەیە و تا هەنووکە دەستنووسن، تێکڕای شیعرەکانیشی فرە ڕەهەند و هەمە چەشنن، بەڵام زیاتر بەلای نیشتمانپەروەری و ئاینی و هاندان و جۆش و خرۆشی نەتەوەییدا دەڕۆن، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر کاریگەرییەکانی حاجی قادری کۆیی لەسەر شیعرە هەمە چەشنییەکانی مەلای گەورە.

**شیعر وەك ڕیفۆرمێکی ئاینی**

هەروەك چۆن ئێستا شیکەرەوان و ڕەخنەگران خوێندنەوەی نوێ بۆ حاجی قادری کۆیی و ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری دەکەن و چەندین مانا و هێمای نوێ لە شیعرەکانیاندا دەدۆزنەوە، بە هەمان شێوەیش بەرهەم و شیعرەکانی ئەم شاعیر و نیشتمانپەروەرەش دەیان شفرە و نهێنی و مانای قوڵی تێدایە کە دەکرێت لە داهاتووشدا توێژینەوە و خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ بکرێت و وەك کەسایەتییەکی نەتەوەپەروەری ڕۆشنبیر و لە هەمان کاتیشدا ئاینپەروەرێکی ریفۆرمخواز سەیر بکرێت، بێگومان هەموو بنەماکانی ڕیفۆرمخوازی لە بەرهەم و شیعر و هەڵسوکەوتی مەلای گەورەدا هەبووە، تەنانەت ئەو پێش زیاتر لە نیو سەدە هەندێ تێز و بیرکردنەوە و تێڕامانی هەبووە، ڕەنگە لە ئێستاشدا لەلایەن موسڵمانان و پیاوانی ئاینییەوە جێگەی وەرگرتن نەبێت و بەجۆرێك لە لادان لە بیروباوەڕ سەیر بکرێت، بەتایبەتیش ئەو ڕەخنە توندانەی کە لە شێخ و ئاغا و دەروێش گرتوویەتی، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا ڕۆشنبیر و ڕەخنەگر و خوێندەواری کورد نەیتوانیوە وەك پێویست ئەو نهێنی

و شفرە گەورانەی جیهانبینی و بەرهەمەکانی دەربخات و توێژینەوەو بەدواداچوونی زانستی لە زانکۆکاندا بۆ بکرێت، بە تایبەتیش هەندێ لەو شیعرانە بۆ ئەو قۆناغە دواکەوتووییەی کورد لە ئاستێکی زۆر بەرزی ڕەخنەگرانەدابوون.
لە شیعرێکی چوار دێڕیی مەلای گەورەدا کە نەجیبەخانی کچی بە دەستوخەت پاراستوویەتی، ڕەخنەی توند لە تەریقەت دەگرێت و دەڵێت :

**تەریقەت بوو ژەهری قەومی کوردی**
**بە بایدا غیرەت و نامووس و مەردی**
**ئەوانی دەوڵەمەندن خەریکی عەیش و نۆشن**
**سەر ئامودانی عیرفان، دائیم مەست و سەرخۆشن**

گەر لەم چوارینەوە جیهانبینی مەلای گەورە بخوێنینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەو هەستی ڕەخنەگرانە و دیدی ڕاشکاوانەی بۆ ژیان و دەوروبەری خستوەتە پێش هەموو شتێکی خورافی و نا لۆژیکی، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لە هەستی ڕیفۆرمخوازی ئاینیانە لای مەلای گەورە، چونکە هەمیشە ڕیفۆرمخوازە ئاینییەکان لای کۆنزەرڤاتیڤی کۆنخوازی بیر و ئایدۆلۆژیا ڕەتکراونەتەوە، دەکرێت نموونەی مەلای گەورە لەو قۆناغەی کۆمەڵگەی کوردیدا نموونەیەکی دیاری ئەو ڕەتکردنەوەیە بێت، دیارە ئەمەش بە تەنها لە ئەدەبیاتی کوردیماندا بەس لای مەلای گەورە نەبووە، بەڵکو دەیان نموونەی تری لە شیعری شاعیرانی کلاسیکیمان وەك نالی و مەحوی و ئەحمەدی خانی زۆر بەڕوونی دەبینرێت، بە بڕوای من پێش بەهای شیعریی ئەو تێڕوانینانە بەهایەکی ریفۆرمخوازانەیان هەیە و دەکرێت بکرێنە هەوێنی پاکردنەوەی بیروباوەڕی ئاینی لە تێڕوانینی کوێرانە و دواکەووتوانە بۆ ژیان و دەوروبەر، ئەم هەستانەش کە شاعیرانی کلاسیکیمان بۆ ژیان و ئاین هەیان بووە تێڕوانینێکی ڕاستەقینانەی ئاینییانەی پاك و بێگەرد بووە.
هەر لە شیعرێکی تریشدا مەلای گەورە بە ناونیشانی (بەسییە بۆ خاتری خوا) بە توندی ڕەخنە لە خانەقا و تەکییە و پیاوانی ئاینی دەگرێت، بە جۆرێك ڕەنگە لە ئێستادا بوونی ئەو رەخنانە جۆرێك لە توندوتیژی ئاینی و کێشە و گرفت بەدوای خۆیدا بێنێت.

**بەسییە بۆ خاتری خوا بەسییە**
**تاکەی بەزمی خانەقا و تەکییە**
**شێخە فەندی ئیتر بترسە لە خوا**
**میللەتی قوڕبەسەر چ حاڵی نەما**
**گەلێ کەس ماڵی خۆی هیبەی تۆ کرد**
**عاقیبەت خۆڵ بەسەر لەبرسا مرد**
**ڕەحمەکت قەت نەکرد بە منداڵێ**
**خەبەرێکت نەبوو لە ئەحواڵێ**
**ژنەکەی دەربەدەر بوو چەند ساڵان**
**تاکو فەوتا لە ڕۆخی ڕەشماڵان**

### *شیعری ئەڤینداری

یەکێك لەو لایەنانەی لە شیعر و بەرهەمی مەلای گەورەدا تا هەنووکە وەك پێویست باسی لێوە ناکرێت شیعری ئەڤینداری و دڵدارییە، ئەمە لە کاتێکدا زۆرێك لە شاعیرانی کلاسیکی کوردیمان پانتاییەکی گەورەیان بۆ شیعری ئەڤینداری داناوە، بێگومان مەلای گەورەش لەو بوارەدا کەمی نەنووسیوە، بە تایبەتیش لەو ٤٠ شیعرە بڵاوکراوەیەیدا چەند شیعرێکی ئەڤینداری هەن، ئەمە جگە لەوەی لە چەند شیعرێکی دەستنووسیشیدا کۆپلە و دێڕی تایبەت بە شیعری ئەڤینداری دەبینرێت، بەڵام وەك پێویست لە لایەن خوێنەران و ڕەخنەگرانەوە بەسەر نەکراوەتەوە.
لە چوارینەیەکی ئەڤینداریشدا مەلای گەورە دەڵێت :

**بەم حاڵە ژینم مەحاڵە**
**دڵ گیرۆدەی خەت و خاڵە**
**سووتاوی سەر کوڵمی ئاڵە**
**بە عیشقی تۆ گرفتارم**
**مونتەزیری یەك گوفتارم**
**نەماوە هێزی ڕەفتارم**

لە شیعرێکی درێژیشدا بە ناونیشانی (تاکەی لە غەمت) جۆرێك لە مەنەلۆژ و دیالۆژ دروست دەکات لە نێوان خودی خۆی و خودی بەرامبەردا، ئەم شیعرەش ڕیتمێکی ڕۆمانسییانەی جوانی هەیە و پێم وایە یەکێك لە شیعرە پڕ لە وێنە و جوانەکانی مەلای گەورەیە، بە تایبەتیش لە وەسف و پێناسی جوان و وێنەی فراوانی تەکنیکی شیعری لە ستایلی چوارینەی تایبەتی شیعریدا.

**تاکەی لە غەمت یەخەی کراسەکەم بدڕم**
**نێزیك لە دەردو حەسرەتی تۆ بمرم**
**بۆ خاتری خودا لە پاشی مەرگم جار جار**
**ئا هێستە لە ڕووی وەفا وەرە سەر قەبرم**
**گەر مەرحەمەتێ بە من دەکەی سابیکە**
**نەم ماوە تەحەمولی جەفا چی دیکە**

ژمارە ٧١
تشرینی دووەم ٢٠١٢

# هەتا شێخێ بمێنێ

هەتا شێخێ لە کوردستان بمێنێ
ئومێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ
تەریقی قادری و نەقشبەندی
بەبای دا ڕەونەق و ئاهەنگی کوردی
هەموویان بوونە سۆفی و پیر و دەروێش
بە بەرماڵ و بە سبحە و ڕشتە و ڕیش
هەموو بێ ئیش و بێ کار و تەوەزەل
ورگ پان و مل ئەستور و سەلك زل
لەوان و ئەرزڕۆم تا حەدی جافان
تەوەلا بوون لە عەقڵ و عیلم و عیرفان
بەوی شۆلی بەوی عەقل و تەمیزی
محەقەق قەومی کورد نایێتە ڕێزی
بە ڕیشی پان و پرچی پڕ لە ئەسپێ
بناغەی ئیشی کوردان چۆن دەچەسپێ
بە کەشکۆڵ و سواڵ و فەقر و زیللەت
مەحاڵە کاکی خۆم تەشکیلی دەوڵەت
هەموو بێ هۆش و بێ گۆش و نەزانن
ئیدارەی موڵك و میللەت چۆن دەزانن
ئومێدتان قەد نەبێ کورد ببێتە دەوڵەت
لە بەدبەختی ئەوێستا بۆتە سێ لەت
ئەوی زانایە ناو جەرگی پەلاسە
ئەوی نادانە نازانێ چ باسە
جەنابی شێخ دەڵێ ئاخیر زەمانە
قیامەت ڕادەبێ هەر بەو زوانە
ئیرادەی خوایە ئێوە هەر وەهابن
وەکو هاروت و ماروت بن سەرو بن
بەڵێ یا شێخ قیامەت لێمە ڕابوو
بە جەهل و تەمبەڵی خانەن خرابوو
لەبەر قەولی پڕ و پوچی ئەمانە
لە دەست کوردان نەما غەیری هەمانە
لەبەر تەزویری وان شێخانی بەد بەخت
گەلی کورد نابنە ساحێب ڕایەت و تەخت
لەبەر چی کاری خەڵکی وا دروستە
ئەگەر هیندۆزە گەر ئاگر پەرستە
ئەگەر لازە ئەگەر ڕۆمە ئەگەر جوو
لە ژێر دەستی ئەم و ئەو پاکی دەرچوو
ئەگەر ڕاستە دەڵێی دنیا خراوە
ئەدی بۆچیتە ئەو ئاو و بەراوە
ئەگەر دنیا خراپە بەو نزیکە
جەنابت بۆ بە دنیا وا خەریکە

مەلای گەورە

## ئەم میللەتە

ئەم میللەتە بەدبەختە کە قەومی کوردن
ئەی وای لە ژێر نیری ئەجانیب مردن
هەرچەند کە مسوڵمانن و ئەهلی سونەن
بلعاتی مەشاییخ بە قوڕی دا بردن
ئەم میللەتە وا بە مەکری شێخی گومڕا
نە عیزەتی دینی ما نە عیزی دونیا
ئێستێش بە فڕو فێڵی ئەوان تێدەکەون
(لا حول ولا قوة الا بالله)
بۆ خاتری خودا موجەدیدی ئەلفی دووەم
جارێکی تەماشاکە لە ڕووی لوتف و کەرەم
لەو ساوە کە تۆ بووی بە موجەدیدی ئوممەت
بوون بە ئەسیر و ژێر دەستی کوللی ئومەم
ئەم تائیفە مومتازە کە گوایا نەقشین
موستەغرەقی یادی خوان لە عالەم وەحشین
با وجودی کە باراش دەبا بۆ ئاشی
هیچی لە دڵا نییە بە غەیری کەری شین
ئەو حەزرەتە وەك نان و پیازی دەبڕی
نێزیکە لە تاوان ڕەگی جەرگی ببڕی
هەر چەندە کەرامەتی وەکو سەگ دەوەڕێ
بێچارە لە بۆ مستە بڕۆشێ دەگەڕێ
قەومێ کە بەناوی دین و ئیمان دەگەڕێن
گۆیا کە لە بۆ خەلاسی ئینسان دەگەڕێن
کەزاب و منافق بەد و بێ دینن
وەك ئاش بە تەماعی ساوەر و نان دەگەڕێن
خالقی ئەرز و سەما عیسایە
بە خودا ئەم قسە بێ مەعنایە
کەسەکی هۆشی هەبێ وا ناڵێ
چۆن دەڵێ وایە ئەوەی دانایە
گوێ بگرە لە جەنابی پاپی ئەعزەم
گویا کە خوداوەندی کەریم و ئەرحەم
خۆی خستە زگی حەزرەتی خاتوو مریەم
تا ببێتە کەفارەتی گوناهی ئادەم
پاشان لە زگی خاتوو مریەم هاتە دەرێ
چەند کەشمە کەش و هەوای هاتە سەری
تا ئاخری کار لە دار درا خودای عالەم

ئا هێستە لە قەبری هاتە دەرچۆتە سەرێ
خۆزی کە نە ئادەم و نە حەوا بایە
سەد خۆزی نە عیسا و موسا بایە
هەر هەشت تەبەقەی بەهەشت بسوتایە
ئەو قسە پڕو پوچە نەگوترا بایە
قەولێکی درۆ و فاسید و بێ ئەسڵ و ئەساس
خارج لە عەقڵی عیباد و مقیاس و قیاس
چۆن دەچتە زگی مریەم خودای بێ هەمتا
دەك لەعنەتی خوا لە ڕۆحی پاپا و شەمماس

## من یەخەی خۆم لەبۆیە دائەدڕم

ساڵی ١٩٢٦ مامۆستا و قوتابیان لە کۆیە بە بۆنەی کارەساتی لە سێدارەدانی سەرکردە و ڕۆڵە قارەمانەکانی کوردی تورکیا بە شێوەی خۆپیشاندانێك ڕوو دەکەنە ماڵی مەلای گەورە، ئەویش ئەم پارچە شیعرە هەست بزوێن و پڕ سۆزەیان بۆ دەخوێنێتەوە کە دووەم شیعری نەتەوایەتی بوو.

من یەخەی خۆم لەبۆیە دائەدڕم
ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم
دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ
قەومی من وا ڕەزیل و ڕیسوا بێ
بێ کەسو بێ دەر و فەقیر و هەژار
بێ سەر و سەرفراز و بێ سەردار
ئەوەی ڕێگای لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خوا لە ئەلحەد و گۆڕی
میللەتی وا فەقیر و بەستەزمان
بە قسەی ئەو کەسانە چۆن خەڵەتان
قوڕی کام جێ بگرمەوە بۆتان
بۆ برایانی جەزیر و بۆتان
خەمی دونیا بکەین بەسەر خۆمان
بۆ عەزیزانی ئەرزەڕۆم و وان
ناوی کوردی نەما لەنێو تورکان
پەتی تورکان و گەردەنی کوردان
با وجودی کە قەومەکی زۆرن
فائیدەی چی کە توخمی خۆ خۆرن
وا دەزانن کە کوردە گەل زیندوون

وا دەبینم عەلەل عموم مردوون
وا ڕەزیل و زەبوون و بێ دەسەڵات
ڕەبی ئەو قەومە بۆچی وای لێ هات
زۆر نەچووپاش (صلاحی) ئەیوبی
کورد کەوتە دەوری مەنکوبی
چ عەشیرەت چ ئەهلی شارستان
لە هەموو تول و عورزی کوردستان
بوونە یەخسیر و نۆکەری ئەم و ئەو
باری خەڵکی دەبەن بە ڕۆژ و بە شەو
لەسەر ئەو حاڵەش یەکتری دەکوژن
خوێنی یەکدی میسالی شیر دەمژن
دەرحەق یەك ئەوەندە زۆر دەوەرن
کەلەکەی یەك بە شیری دەم دەبڕن
بە زگێ تێر بە دوو زگان برسی
هیچ لە چاکە و خراپە ناپرسی
جاهیل و بێ کەماڵ و شەرمی حزور
ئەبغەزی خەلقی خوا فەقیرو فەخور
حەیفە بۆ غیرەتی سەلاحەدین
ئەو کەسانە بڵێن ئەمەش کوردین
وا مەزانن کە میللەتی کوردی
بە زەلیلی بژیت و نامەردی
ئەوی کورد بێ لە نەسلی باب ئادەم
ئیشەکی تورك و گوێ درێژی عەجەم
حەز دەکەی پێت بڵێم چیە کوردی
عاقڵی و چاپوکی و جەوان مەردی
میللەتێکە لە فەوقی تورك و عەجەم
ساحێبی حەزم و ڕەزم و بەزم و کەرەم
لاوەکان قەدری ئەسلی خۆ دەگرن
پیرەکان با لە زیللەتا بمرن
خاسەنە و باوەکانی مەکتەبی کۆ
دەبنە پشت و پەناهی میللەتی خۆ
ئێوە ئەولاد و جەرگ و ناوی منن
ئێوە نووری گلێنەی چاوی منن
عومری خۆتان مەبەن بە خۆڕایی
تێبکۆشن بە عیلم و ئازایی

# ئازاد بوونی ژن

خودا دەڵێ لە قورئان
فأمساك بمعروف
بڵێن بە قەومی کوردان
عەیبە بە حەقی یەزدان
ژن زینەتی دونیایە
حەبیبی موستەفایە
ژن ئەگەر بە حورمەت بێ
بە تەربیە و ڕەحمەت بی
کوڕی دەبێ وەکو شێر
بە دڵ غەنی بە چاو تێر
ژنێکی دەربەدەر بێ
ڕەزیل و دەست بەسەر بێ
دەبێ ئەولادی کوبی
مێشکی وەکو کدو بێ
زەرد و زەعیف و باریك
لوت بە چڵم و دەم بەلیك
دەرحەق ژنان بێ باکن
سەیری حاڵی خۆ ناکەن
تەربیە لەلای داکە
باب لە ئەسلا بێ باکە
داك مامۆستای فیترییە
مادی یا مەعنەوییە
کە داکی چاکی نەبی
چلۆن تەئسیری دەبی
دۆڵ و زوڕناو هەڵپەڕین
زۆر پێ ناچێ دەبینین
ئەوەڵ خەزور و خەسو
بەدزی یا ڕوو بەڕوو
ڕۆڵەت ژنت تەلاق دە
لە کچانی بەگزادە
دەبینی بوکی ساڵی
بەتای سۆڵ و بەرماڵی
لە شەریعەتی ڕەسوڵ
حەرامە قەتعی مەوسول
ژنیش وەك موزەکەرە
چاو لادانی لەسەرە
وەزیفەی زۆر گەورەیە
منداڵ بوون و تەربیە
ژنان قەد تەڵاق مەدەن
وەکو ڕۆح لەگەڵ بەدەن

الطلاق مرتان
آو تسریح بآحسان
دەستی من و دامێنیان
ژن هێنان و تەڵاقدان
ئەمانەتی خودایە
قەلاتن لەبۆ مێردان
بێ زیللەت و زەحمەت
دڵ گوشادو لێو خەندان
عاقڵ و داناو دلێر
سەردار و مەردی مەیدان
دڵ پڕ غەم و کەدەر بێ
وەك مەحبوس لەناو زیندان
بێ ڕووەت و بێ ڕوو بێ
ترسنۆك وەك یەهودان
گوێ گران و چاو تاریك
سارد و سڕ و سەر گەردان
بۆیە بێ داکی چاکن
وەك دڕکن لەناو عەردان
داك چابی ئەولاد چاکە
فەرقەکی ناکا چەندان
تەشەکولت لەوییە
ڕوشدە یا لەڕی لادان
سی سەد حەدیسی (نەبی)
وەك پف لە پەتك و سندان
ژنی بۆ کوڕمان دێنین
شەڕو شۆڕو تێك هەڵدان
تێ دەکۆشن دوو بەدوو
لێکیان دەکەن بە خەندان
بۆت دەهێنم هەتا دە
بیکەینە خەنە بەندان
دەری دەکەن لە ماڵی
بێ ئاوێنە و بێ کلدان
بێ عوزرەکی زۆر مەقبوڵ
گوناهە دەست لێك بەردان
عەینی ئەویش بەشەرە
هەردوو لەیەك حوکمدان
دەزانی ئەویش چیە
بێ مەسخەرەو جوێن پێدان
لەگەڵ یەك مومتەزیج بن
بە ئولفەت و دڵشادان

مەلای گەورە

# هەناسەی نەوتاوی

**یا ڕەببی بە لوتف و جود و ئیحسان**
**لوتفێکی بکەی لە حەقی کوردان**
**قەومێکی فەقیر و ناتوانا**
**بێ پەروەر و بێ پیاوی دانا**
**بێ مورشید و عالمی سیاسی**
**بێ (مصدر) (قاعدەی) ئەساسی**
**بێ ڕووح و حەیاتی ئیجتیماعی**
**بێ قودرەت و قووەتی دیفاعی**
**بێ دەفتەر و کاغەز و کیتابەت**
**بێ سنعەت و حیرفە و کەسابەت**
**خاکێکی هەیە وڵاتی کوردی**
**ئیکسیرە وەلێ لە چنگی مردی**
**خاکێکی ئەوەندە پاك و ڕەنگین**
**قەومێکی ئەوەندە فەقیر و بێ تین**
**ئەی کاکی نەفامی گەوجی مل هوڕ**
**بنواڕە لە دەوری بابەگوڕ گوڕ**
**ئەو نەوتە چی بوو چۆن بەدەرکەوت**
**چۆن هەر دەقوڵێ مەنابیعی نەوت**
**ئەو نەوتە بوو ئاگری هەڵای ساند**
**چەند دەوڵەت و تاج و تەختی فەوتاند**
**بۆ ئەو نەوتە بوو کە چواردە ملیۆن**
**عەسکەر لە فەرەنگ و نەسلی مەیمون**
**بۆی هاتنە نزاع و حەرب و کوشتن**
**تاکو بە مەرامی خۆ گەیشتن**
**ئەو نەوتە چبوو... حەیاتی تۆ بوو**
**وەی خۆڵ بەسەر ئەویش ئەوا چوو**
**ئەی کوردی نەفامی خانە وێران**
**وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران**
**ئێستێکە گەلێ مەعادنی دی**
**پەنهانە لە ئەندەروونی عاردی**
**وەك مەعدەنی زێڕ و زیو و سەردەف**
**تۆس لێدە لە تەپڵ و دمبك و دەف**

ئەو نەوتە لە خاك و موڵكی كوردی
كێ خستیە دەست و هات و بردی
هەر نەیسە كە ئینگلیز و ئەفرەنج
پاش حەرەبەكی زۆر بە میحنەت و ڕەنج
بەو فیكری عەمیق و حدس و حسە
گەر بتە شەریكی نەفع و حیسە
ئەو نەوتەیە گەنج و ماڵی كوردی
بۆچی... پیس بردی
بیبات و لە نەوسی خۆی خەرج كات
ئەم كوردە فەقیرە چی بەسەر هات
ئەم میللەتە گەورە و عەزیمە
سی پارچە كراوە بۆتە قیمە
قسمێكی لە جەوری توركی غەددار
هاواری دەگاتە چەرخی دەووار
قسمێكی لەژێر نیری ئێران
سوتاوە هەناوی بۆتە بریان
قسمێكی لە ترسی سووری چاوشین
كەوتۆتە لیباسی ماتەم و شین
دەوجا وەرە سەیری ئەم حیسابە
ئەم لالە چلۆن دەبێتە یابە
ئەم موڵكە بە قیمەت و وەسیعە
بۆچی دەدرێ بە كاكی شیعە
قولتێكی لە دەوری بابەگوڕ گوڕ
نایدەم بە منارەكەی ئیمامی دوور
بستێ لە وڵات و موڵكی كوردی
نایدەم بە مەرقەدی (سەهرەوەردی)
(نزرو) هبەو (عزا) دەمێنێ
سەد مەعدەن و كانی نەوتی دێنێ
ئەم موجتەهیدانە پاكی كوردن
ئێستەش بە تەماعی ماڵی كوردن
هەر ڕۆژە لە دەوری مەرقەدێكی
بۆیان گر دەبێ بەقەد لەكێكی
هەر كوردی فەقیری خانە وێران
نە قەبری هەیە نە بیر نە زیندان

ئەو نەوتەیە مایەی حەیاتی
ئەو نەوتەیە سەروەتی وڵاتی
مەحرومە لە حاسڵاتی ئەرزی
بێچارە ئەوا دەخوا و دەلەرزی
قەتعی نەزەریش لە مەعدەن و کان
ئەم ئاو و بەراوی موڵکی کوردان
کردیان بە ئەرازی ئەمیری
وەی خاك بەسەرت تۆش ئەسیری
هەر وەختە لە داخی ئێوە بمرم
ڕۆیوە قەرار و هۆش و سەبرم
چ بکەم چ بڵێم لە تاوی کوردان
ئاگر دەگری دڵم لە دەردان
چارەی چییە خوایە تۆ دەزانی
خۆت عالمی زاهیر و نیهانی
ئەو زوڵمە قەبوڵ نەکەی خودایە
ئەسڵەن ئەمەلم بە کەس نەمایە
لوتفی تووە مەلجەئو پەناهم
ڕەحمێکی بە کورد بکەی ئیلاهم
وەك دێتە دڵم خەیاڵی نەوتێ
هەندە نامێنێ جەرگم بسوتێ
قەومێ کە فەقیر و نا تەوان بێ
قەومێ کە زەلیل و بێ زوبان بێ
ئەلبەتە خراپتری بەسەر دێ
جێی ناکەنەوە لەشارو لادێ
وەك بزنی گڕو دەبێ دەری کەن
نابێ تخونی بێرو مەڕی کەن
تا ئێوە لە حەق ئێکدی خرابن
بەد خواهو حەسوود و نا تەبابن
تا ئێوە لە هەق ئێکدی بە کەیدن
هەر لە ژێر چەپەڵۆکی عەمر و زەیدن

لەساڵی ١٩٣٠ ئەم شیعرەی داناوە

# ئەگەر عیزت دەوێ

ئەگەر عیزت دەوێ هەستی بە هیممەت
بەفکر و سەبر و تەدبیر و کیاسەت
ئەبێ میللەت هەموو یەکبن لەگەڵ یەك
لە ئەربابی قەڵەم تا خاوەنی چەك
ئەگەر کوردێك ئیهانەت کەن لە بەسرە
هەموو بێنە خرۆش و جۆش و نەعرە
هەتا حەققی نەسێنن ڕانەوەستن
لەبەر بێ ئیتیفاقی خوار و پەستن
خەزێنێکو هەبێ ماڵی عمومی
وەکو جوو ئەرمەن و بۆشناق و ڕۆمی
لە لیرە و ڕۆپیە و چارێگ و غازی
بە کەڵکتان دێ لە ڕۆژی پەنجە بازی
فڕێی دەن مونتەشا و بەرماڵ و کەشکۆڵ
تەرك کەن تەپڵ و ڕەقس و خدمەت و شۆڵ
وەکو شێر وەرنە مەیدانی جەرائەت
بە غیرەت بن بە غیرەت بن بە غیرەت
تفەنگ و تۆپ و تەیارە پەیا کەن
بە عیزی دین و دونیا ڕوو لە خوا کەن
پیاوی ترسنۆك وەك پوشکە سووکە
ژنی بێوە بە کورکە و نوکە نوکە
سەحابەی ڕەش ئەوا قەبری دیارە
مەسافەی سی سەعات دووری لە شارە
سەحابەی موستەفا گەر ترسنۆك بان
چ ئیشیان بوو لە توورکستان و ئێران
نەکەن خۆفی نەکەن ترسێ لە هیچ کەس
بە غەیرەز خالقی دەوواری ئەقدەس
دەبێ بێشك و شوبهە وابزانی
بە تەحقیری حەیاتە زیندەگانی
ئەوی دونیای نەبێ دینی زەعیفە
مەلا بێ یانە شێخ بێ یا خەلیفە
مەداری دین و دونیا هەر غینایە
بەڵێ (الفقر فخری) ئیفتیرایە
هەوای گەورەیی دەرکەن لە نێو سەر

بەبێ تۆپ و تفەنگ و ماڵ و عەسکەر
موحەقەق تا قیامەت نابنە بەگ لگ
ئەگەر هاویو نەبێ یان ئۆن ئیکی لگ
بە غەواسو بە پاپۆڕو زرێلی
{بە باڵۆن و بە دۆنمای زرێلی}
لە دنیا هەرچ بێ کوردی موحەققەر
بەبێ پارە لە بۆت نابێ مویەسەر
وڵاتێکتان هەیە پڕ کان و مەعدەن
بە بێڵ و پێمەڕە دوو قۆڵتی لێدەن
دەزانن ناوی ئەرزی چی تیایە
وەلێ مەوقوفی عیلمی کیمیایە
هەتا ئەو عیلمە چاکی نەخوێنن
دەبی هەر پاقلە و سلقێ بچێنن
مەلای نادان بە عینوانی شەریعەت
حەرامی کرد لە تۆ عیلمی تەبیعەت
لە بۆیە هەرچی لەو خاکە بە دەرکەوت
لە ڕادیۆم و لە زێڕو باقر و نەوت
هەمووی کەوتۆتە ژێر دەستی فەرەنگان
چیاو چۆڵان دەنۆڕن وەك پڵینگان
تەماشاکەن چیایان چۆن دەکۆڵن
هەتا کەی ئێوە هەر بەرماڵ بەکۆڵن
خوری و مازی و کەتیرە و چەوت و گروان
وەکو سیچکە و گلێخە و ڕۆنی قەزوان
دەخیلوبم نەکەن بیدەن لەدەست خۆ
وە ئیلا وا بزانن ڕۆح و دەرچوو
هەتاکو نەبنە خاوەندی سەنائیع
هەموو ئینعامی خوا دەڕوا بە (ضایع)
بەخۆڕایی دەچی عومری عەزیزتان
بە هاوین و بەهار و پایز و زستان
مەچوونە خانەقا و چایەخانان
ئومێدم وایە ببنە خانی خانان
ئەگەر خواهیش ئەکەن خوالێیبوبێ ڕازی
مەچوونە تەکیەکان بۆ حوقە بازی
قوماری قەت مەکەن ئێوە و خوداتان

دەنا بەرباد دەبێ ماڵ و منداڵتان
بەجێی بێنە ئەوەی واجب کرایە
بەوی نەوعێ کە مەتلۆبی خودایە
ئەگەر باب جاهیلە با کوڕ مەلا بێ
لە ئەحواڵی ئومەم تا شارەزابێ
سیاحەت کەن بچن بۆ چین و ژاپۆن
ئەمێستا چین لەپێشانیش چلۆن بوون
چ ناوێکیان نەبوو (بین الخلائق)
ئەمێستا بۆچی بوونە (شەمسی شارق)
لەگەڵ ڕووسێکی وا زۆر و بە قووەت
شەڕی کرد و چلۆنیش وا بەسەرکەوت
چ ژەهراوێکی دایە دوبی ئەکبەر
شکاندی سەتووەتی سوڵتانی قەیسەر
لە دونیادا هەر دەبێ کوردی بەدفەڕ
نەبێتە خاوەنی (دەیهیم) و ئەفسەر
لە ژێر کەوتوو ڕەزیلی کوللی میللەت
بەڵای لێدا ژیانی وا بە زیللەت
نەمان خوێند و نەمان دیت و نەمان بیست
عەلەم دارێ لەنیو کوردان هەڵستێت
ئەتۆ ئەی مامە کوردە پیم بڵێ چیت
کەڵاش خوار و کراس دڕیاو کەوا چیت
کەپو قیچ و لچ ئەستوور و ددان گڕ
کوت و کۆڕ و کەڕ و گێژ و سەلك خڕ
هەتا دەمری بە خواری ڕادەبوێری
بەبێ بەختی و بەبێ دەستی و فەقیری
بە جان و دڵ لە ڕەبی خۆت دەخوازی
زگت پڕ بێ لە ئەستورك و پیازی
بە کوردی پێت بڵێم ئیشت شلۆقە
دوای چی کەوتووی بەو گورگە لۆقە
گرینی من لە بۆ تۆیە وە ئیلا
تەماعم پێت نیە حاشا وەکەللا
ئەتۆ چۆنی بژی من هەر مەلامە
ئیتر بەسیە برام خەتمی کەلامە

# دەڵێن باران بە ئەمری شێخ دەباری

دەڵێن باران بە ئەمری شێخ دەباری
بە ئەمری کن (فکان) وەك ئەمری باری
خولاسە کافەیی زەرراتی عالەم
چ ئەفلاك و چ ئەملاك و چ ئەنجوم
بە ئەمری حەزرەتی پیرە دەوامی
حەیات و مەوت و تەرتیب و نیزامی
مەلایێ گەر بڵێ نابێ وەها بی
دەڵێن ئەو فاسیقە بوویتە وەهابی
ئەرێ ئەی شێخە پیسی بۆری چڵکن
ئەرێ ئەی زگ هەمانەی غازی بۆگەن
ئەتۆ دەواری چەرخی بێستونی
ئیرادەی تۆیە تەنزیمی شوئونی
ئەرێ ئەی شێخە کۆری خواری مەخزوم
ئەتۆی نایب مەنابی حەیی قەیووم
ئەتو ئەی پیستە خۆری لینگ گاوی
لەگەڵ زەرڕاتی عالەم تێکەڵاوی
ئەتو ممتازی رزقی مار و موری
ئەتۆ ئینشا کوننەدەی نار و نوری
بە حوکمی تۆ دەبێ عەفوی گوناهان
وەکو پاپای نەسارا خێوی غوفوران
هەموو عالەم لەژێر فەرمانی تۆیە
حەیاتی تۆ بە مستەك ئاردی جۆیە
ئەوی عەفوی بکەی جێگای نەعیمە
ئەوی عەفوی نەکەی مەئوای جەحیمە
ئەگەر مولکە هەموو مولکی خودایە
ئەگەر شێخە ئەگەر قوتبە هەبایە
ئیرادەی قودرەتی خوای من تەواوە
چ حاجەتمان بە شێخ ڕایی کراوە
بە ئەقتاب و بە ئەوتاد و بە ئەقوال
نەبوونە ئادیسۆن ئەی مەردی بەتاڵ
لە عیلم و ئیختیراع چی بەدەرخست
بڕۆنە... میللەتی خۆی چۆن بەسەر خست
بە عیلمی کیمیا و قووەتی نوور
بە تەیارەو بە زەبلین و بە واپۆڕ

چلۆن قوتبی فەقیریان پێ نیشان کرد
پرۆژەی شێخ ئەفەندیشیان عەیان کرد
موسوڵمانان لە چەنگ وان کو زەلیل بوون
دە فەرمووو شێخە شێتی گێژ و مەجنون
بزانم تۆ ئەوێستا چیت لەدەست دێ
لە بەحر و بەڕ و چۆل و شار و لادێ
وەرن ئەی ئومەتی (خیر البریة)
لەپاش تەقدیمی (اخلاص) و (تحیة)
بە عیلم و عەقڵ و هۆشو فکر و عرفان
بە قەولی موستەفا و ئایاتی قورئان
بزانن ئەو قسانە پاکی پوچن
ئەگەر خوامان هەبێ ئەقتاب لەبۆ چن
بە قەولی جاهیلان خۆتان مەگۆڕن
بەچاوی دڵ لە دونیایێ بنۆڕن
لەژێر ئەرزی هەتاکو ژوور و ژێروو
لە مانگ و ڕۆژ هەتاکو مار و مێرو
بە (کم) و (کیف) و وەزع و چەند و چوونی
بە (اطوال) و بە ئەدوار و سکونی
گەلاوێژ چەند زەلام و چەندە دوورە
سوها تاریکە یاخود زۆر بە نۆرە
(ضیاء) چۆنە لەچی تەرکیب کرایە
نیزامی ئەو عالەمە چۆن داندرایە
بەچی دەکرێ بەکێ دەکرێ ئیدارە
لەبۆ کێ دێتە تەعداد و ژمارە
بە غەیرەز قودرەتی داواری جەببار
بە غەیرەز پادشای خەلاق و قەهار
بە قودبێکی زەعیف و ناتەوانە
ئیدارەی چۆن دەبێ ئەی مەردی دانە
ئەوی لای ئێوە داواری ئەمورن
لەبەر دەستی خوا کەمتر لە موورن
کەسێ ئیمانی بە خوا و قودرەتی بێ
چلۆن ئەو ئیعتیقادەی دەچێتە قەلبێ.

تێبینی: (اطوال) بە عەرەبی واتە درێژی و پانی.
هەروەها (ضیاء) واتە ڕووناکی.

